(وَلا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ)

# ئابووری له ئیسلامدا



نووسەر:

ماموّستا عبدالقادر توحیدی

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس وسەنای شایان پێشکەش بەزاتی خوای خاوەن بەخشش وکەرەم لافاوی ڕەحمەتی خوا بڕژێ بەسەرگیانی پاکی پێغەمبەرویارولایەنگرانی هەتاهەتایە.

ئیسلام ڕێبازیخوای خاوەن بەخشش وکەرەمەو هەروەکو خاوەنەکەی هەرگۆشەیەکی هەڵدرێتەوە ئەوەندە ووردەکاری تیاکراوە وائەزانرێت کەتەنیا لەوگۆشەدا ئاگادارەو پڕیەتی لەخەیروبەرەکەت وبۆهەرگۆشەیەکی ژیانی ئادەمیزادبەرنامەیەکی تێروتەسەلی وای هەیەکەهیچ بەرنامەیەکی دەست کردی بەشەرناگات بەتۆزی قولیاو هەموومرۆڤێکی ژێرودانالەبەرانبەریەوەسەری ڕێزی بۆنەوی ئەکات وەدەستی بۆبەسینگەوە ئەگرێت ودان بەوەدائەنێت کەتەنیاخاوەنی ئەویاسایەماڤی گوێڕایەڵی وپەیڕەوی کردنی هەیەوکەسی تر.

گۆشەیەك لەوگۆشانە ئابووری یە(الاقتصاد)کەلەم بوارەدا تاقانە ڕێبازی دادپەروەری کۆمەڵایەتی یەوتائەویاسا، کاربەدەستی وولات بووەکەسێك بیٚ مشورخۆرنەمابووتەنانەت لەوئەفریقای کەئەمڕۆ ڕۆژانەلای کەم چل هەزار منالٚ لەبرسیا ئەمرێت وگویٚ ی خەڵك لەقسەی بریقەدارو ووشەی ماڤ مرۆڤ خەریکە هەلا هەلا ئەبێت فەقیرێك نەمابوو زەکات لە(بیت المال)وەرگرێت جابائەوانەی کەخۆیان بەدڵسۆزی مرۆڤ ئەزانن زانایانەوبیٚ غەرەز سەرنجێك لەم ئایینە ئینسان پەروەرە بدەن وقازانج وسوودی خۆیان وگەلەکەیان لەو وەرگرن ولەمە زیاتر باگەلان بەتایبەت گەلی بەشخوراوی کوردمان دەربەدەروچەوساوەو ژێر چەپۆك نەبێت وتراوە(هەڵە لەهەرکوێیدا وازی لیٚ بێنیت هەرقازانجە)هەرشتێك کەمایەی خەیروخۆشی مرۆڤ بێت ئیسلام داواکاریەتی وهەرشتێکیش کەمایەی خراپەو کەمی وزیانی مرۆڤ بێت ئیسلام بەتوندی بەگژیائەچێت کەوابووباهەموخەڵك بزانن کەدڵسۆزانی ئەوانەن پەیڕەوانی ئیسلامن وناحەزانی لایەنگروپەیڕەوانی بەرنامەو ڕێچکەکانی ترە جائەو کەسەی کەلەبارەی ئیسلامەوە شتێکی ناڕێکی لەدڵدایە بابێتە مەیدان ودەستی لەسەرتاقە خاڵێکی ناتەواوی دانێت وەئەگەرمەردی مەیدان نی یە بادەست لەشەیتانی و خەڵك فریودان بکێشێتەوە ئیسلام چیایەکی زۆر بەهێزەو هەرکەس سەری لیٚ دات تەنها مێشك پژانی بۆئەمێنێتەوە، بەهیواین هەموخەڵك، بەرەوڕێبازی خوای خۆیان بگەڕێنەوەویەك دڵ ویەك دەست بۆخۆشبەختی هەموان تیٚ بکۆشن.

ئەگەرخوایاربێت گۆشەیەکی کورت وبچوکی ئابووری لەئیسلام دا بەزمانی هاوولاتیانم ئەخەمەبەردەست لاوەخوێن گەرم وتازە پێگەیشتوەکانم تاچاکتر ڕێبازەکەی خۆیان بناسن وچالاکانەتربۆی هەولٚ بدەن وخۆیشیان باشتربناسن وئێمەیش لەدوعای خێربیٚ بەش نەکەن ولەهەڵەکانیشمان ببوورن چونکەئینسانین وئینسانیش بیٚ هەڵە نابیٚ وڕەحمەتی خوالەوکەسەبێت کەهەڵەکانمان بەدیاری بۆئەنێرێتەوە.

### سامان لەئیسلام دا:

سەروەت وسامان لەڕوانگەی ئیسلامەوە شتێکی زۆربەکەڵك وپێویستەوژیانی مرۆڤ بەبێ سەروەت وسامان شتێکی خەیاڵییەویەکێك لەئەرکەکانی سەرشانی مرۆڤ لەم جیهانەدا ئاوەدان کردنەوەی ئەم زەوییەیە، بۆیە ئیسلام هەمیشە خەڵك هەڵ ئەنێ لەسەرتەلاش وکۆشش وخۆشی لەبێ ئیشی نایەت وبەپێچەوانەوەی هەندێك لەبیروڕا پوچان دین ودنیای لاتێکەڵاوەو هیچ کامیانی بێ ئەوی تری ناوێت ئەوەتە خوای گەورەوزاناڤەرمان پێ ئەکاتکەلەپاش عیبادەت بەگۆشەوکەناری ئەم ئەرزەدا بگەڕێین وەپێ بژێوی خۆمان پەیداکەین وئەفەرموێت:

(فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ)الجمعة/10

واتە: کاتێ نوێژکرا بڕۆن وبلاوببنەوە بەسەر زەویداو لەفەڕونیعمەتەکانی خواپەیدابکەن. ئەوهەڕەشەو بەخراپەوناوبردنی ماڵە لەئیسلام دا وەختێکەکەئەوماڵە لەدەستی ئینسانی خراپابێ وکابرا بەوماڵەو لەخۆی بایی ببێت وبەهۆی ئەوماڵەوە خۆی بەزل بگرێت وستەم لەخەڵکی بکات، ئەگینا ئیسلام زۆر پێ خۆشحاڵە بەبوونی ماڵی پاك لەدەستی ئینسانی چاکداوئەفەرموێت(نعِم المالُ الصّالِح للرَّجُلِ الصّالِح )ئای چەندچاکەماڵی چاك لەدەستی مرۆڤی چاکدا هەروەها ئیسلام داوالەخەڵك ئەکات کەلەم ژیانەدا کەمتەرخەم نەبێتوئەفەرموێت : (وَلَا تَنْسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا وَأَحْسِنْ كَمَا أَحْسَنَ اللَّهُ إِلَيْكَ)القصص/77

بەشی دنیای خۆتت لەبیرنەچێتەوەو چاکەکاربەهەروەکوخواچاکەی کردووەلەگەڵ تۆدا وەوتراوە(وائیش بکە بۆدنیا وابزانە نامریت پێویستە ئەوەیشمان لەبیرنەچێت کەئاوەدان کردنەوەی زەوی بێجگەلەخۆشی وکامەرانی ژیانی دنیای زەحمەتکێشان سوودوبەرەکەتێکی ئێجگار زۆری هەیەبۆی لەڕۆژی دواییدا وەك لەم فەرموودەبەنرخەی پێغەمبەری مەزن دا(ﷺ)هاتووەکەئەفەرموێت: (مَامِنْ مُسْلِمٍ يَغرِسُ غَرساً أوْيَزرَعُ زَرعاً فيأكُلُ مِنهُ طَيْرٌ أوبَهيمةٌ الا كَانَتْ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ)واتە: مرۆڤ هیچ نەمامێك نانێژێ وهیچ تۆوێك ناچێنێ کەمرۆڤ بیخوات یاحەیوان یابالَندە مەگەر بۆئەوبەچاکە حیساب کرێت، واتە: لەوکۆشش وتەلاشەی هیچی بەزایە ناچێت وەچاکەیش پاداشتی لەدەبەرانبەر کەمترنی یە، ئەوانەی کەگوێ بەئاوەدان کردنەوەی زەوی نادەن وبەشتێکی بێ نرخی ئەزانن زۆر بەهەڵەداچوون چونکە خوانەپێویستی بەئاڵتون وزیوومس وباقی کانەکانی ترهەیە نەپێویستی بەنەوت وغازە بەڵکو هەمووی بۆئێمە داناوە وهەڵیشمان ئەنێ بۆسوودلێ وەرگرتنیان:(هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا)البقرە/29

واتە: خوائەوزاتەیە کەهەمووئەوشتانەی ناوزەوی بۆئێوەدروست کردووە، وەهەموویشی ڕام وگەردن کەچ کردووەبۆینسانەکان بەبێ جیاوازی لەنێوان ڕەنگ ونەژادو کوفروئیمان دا وەلەم بارەیەوە دەیان ئایەت وفەرموودەی پێغەمبەری مەزن( ﷺ)هەیە کەئێمەتەنهابۆنموونەئەوچەنددانەمان باس کرد، بۆزیاترشارەزابوون تەماشای قورئان وپەڕاوی فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەری پایەبەرز(ﷺ) بکەن.

کێ خاوەنی سامانە؟

خاوەنی ڕاستەقینەی سەروەت وسامان تەنها خوایەوزەوی وئەوەی کەلەسەروناویزەویداهەیە هەمووی موڵکی خوایەوتەنها ئەوحەقیەتی چۆن ئاڵوگۆری تیابکات وکەسی تر(لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ)الحج/64

واتە: هی خوایەئەوەی کەلەناوئاسمانەکان ولەناوزەویدا هەیەوەبەڕاستی تەنهاخوایە بێ نیازوسوپاس کراو.

خوای گەورە مرۆڤی دروست کردتاجێنشینی ئەوبێت لەم سەرزەویەداوخاوەنیەتی کاتی، بەوبەخشی وڕێبازی چۆن ژیانی بۆناردوهیچ کات خۆی لێ کەمتەرخەم نەکردووەوبۆهەمووگەلێك بەرنامەونێرراوی ناردووەکەئاخریان حەزرەتی موحەممەدی کوڕی عبداللەیە( ﷺ)بەپەڕاوێکی گشتی وبۆهەمووکەس وتانەمانی ئەم ئەرزە، واتەئێمە وەکیلی ئەوزاتەین و پێویستە بەگوێرەی فرمانی ئەولەم سەرزەوییەدا بجولێینەوەجاشتێکی بەڵگەنەویستە کاری جێ نشین وکراو بەوەکیل وەختێ ڕەوایە کەبەگوێرەی خاوەن جێ ووەکیل گرلەوشتەی کەپێ ی سپێرراوە ئیش بکات ئەگینا

ئیشەکەی ناڕەواو نادروستە وئەبێ خۆی بەرپرسی هەموزیانەکانبێت واتەئیشەکانی ئێمە لەم سەرزەوییەدا ئەبێ بەگوێرەی یاسای خوابێت ئەگینا ناڕەواونادروستەوتاوانەکەی بەئەستۆی خۆمانە.

## خاوەنێتی تاك(المكية الفردية):

لەڕوانگەی ئیسلامەوە هەموومرۆڤێك ئەبێ بەخاوەنی ئەوشتانەی کەبەکەلەپوریابەهۆی کڕین وفرۆشتن یابەکرێکاری یابەهۆی بەخشین وەیابەهەر هۆیەکی تری شەرعی یەوە، دەستی ئەکەوێت ڕونترین بەڵگەی ئەوخاوەنیەتی تاکە ئەمانەن:

1. دەست بڕینی دزچونکە ئەگەرهەرکەس هەرچی دەست کەوت هەرهی خۆی بێت بۆچی دەستی دزئەبڕن؟
2. ناڕەوابوونی داگیرکردن وفڕاندن وفێڵ کردن چونکە ئەگەریەکەم خاوەن نیە دوهەمیان بۆتاوانە؟
3. پاداشتی خوایە لەسەر بەخشین جائەگەرخاوەن ماڵ نیە بۆچی ئەبێ پاداشتی بدرێتەوە؟

## ڕێگای زۆرکردنی ماڵ:

ئاینی ئیسلام لەچەند ڕێگاوە ماوەی بەزیادکردنی سەروەت وسامان داوە، کەپاك وخاوێن تریان زەحمەت دانی شان وبازووەبەڵام ئەوەنەبێت تەنها هەرئەومەرج بێت بەڵکوپێویستە پەیداکەروپەیداکراووبەوشێوەبێت کەئیسلام ڕێگای پێ داوەهەربۆیە پرسیاری ماڵ لەڕۆژی دواییداووپرسیارە یەکەم چۆنت دەرهێناودووهەم چۆنت خەرج کرد( مِنْ أينَ اكْتَسَبْتَهُ وَمَنْ أينَ أنفَقْتَهُ )جائەم ڕستە، گەلێك پڕمانایەوئەتوانم بڵێم هەرئەم فەرمودەیە بەسە بۆڕێك وپێك کردنی باری ئابووری لەناو خەڵکاو هەموبەشەکانی ژیان ئەگرێتەوە.

وەکو وترا، لەچەند ڕێگاوە ماڵ زاوزێ ئەکات وشێوەوناوی زۆربەیان لەیەك جیایە جائێمەیش بەیارمەتی خوای خاوەن کەرەم، یەك یەك باسی، ئەوڕێگایانەتان بۆئەکەین وهەوڵ ئەدەین کەبەشێوەیەکی گوشراوبێت تائێوەی خۆشەویست زۆرماندوونەبن لەخوێندنەوەی داونەڵێن(خوێندنەوەی ڕێگای ئیش کردنمان لێ ئەگرێت).

## یەکەم/کرێکار:

کرێکار ئەومرۆڤە بەنرخەیە کەبەهێزی خۆی ئاسودەی خۆی وخەڵکی تردابین ئەکات، کرێکار ئەومرۆڤەبەڕێزەیە کە پێغەمبەری‌ئیسلام(ﷺ)دەستی ماچ ئەکات وئەفەرموێت( تِلكَ يَدُيَحِبُّهَاالله وَرَسولُهُ )ئەوە دەستێکە خواوپێغەمبەری خواخۆشیان ئەوێت.

کرێکار ئەومرۆڤەیەکەپاك ترین وچاکترین خۆراك ئەخوات(ماأكَلَ أحَدٌ طَعاماً قَطُّ خَيْراًمِنْ أنْ يأكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ )واتە: هیچ کەسێك خواردنێکی نەخواردووەکەچاکتربێت لەخواردنی ئەوکەسەی کەبەدەستی خۆی دەری هێنابێ.

کرێکار ئەومرۆڤە بەنرخەیەبۆیە ئەوەندە ئیسلام داکۆکی لەسەرئەکات وبەتوندی دژی ماف خورانی ئەوەستێت کرێکار خۆشەویستی خوایەو ئاشکراکەری نیعمەتە لەژمارە نەهاتوەکانی خوای گەورەیەو ئیشەکەی وەکوغەزایە( انَّ اللَّ‌ه يُحِبُّ العَبْد المُحتَرِفَ وَمَنْ كَدَّعلى عَيَالِهِ كَانَ كاالمُجَاهِدِ في سَبيلِ اللهِ عزَّوَجَلَّ )ئیمامی ئەحمەد، واتە: خوابەندەی پیشەسازی خۆش ئەوێت وەهەرکەسێك کەزەحمەت بکێشێ بۆبژێوی خۆی وخێزانی وەکوغەزاکەر وایە تەماشاکەن زەحمەت وتەلاشی مرۆڤ بۆپەیداکردنی بژێوی حەڵاڵ چەندبەنرخە لەڕوانگەی ئیسلامەوە.

## مافی کرێکار:

کرێکار زەحمەت کێشی خۆی وخەڵکەومافی زۆری بەسەرخەڵك ومیریەوەهەیە کەگرنگترینیان ئەمانەن:_

1. پێویستی سەرشانی میرییەکەئیش بۆکرێکار پەیدابکات.
2. ژنی بۆبهێنێ ئەگەرژنی نەبوو.

3. ئەگەرخانووی نەبووخانوی بۆبکات.
4. هۆی ئازوگویازی لەماڵەوە بۆسەرئیش وگەڕانەوەی بۆئامادەبکات.
5. کریێ ی ببێت وبەخۆڕایی ئیشی پێ نەکرێت.
6. کرێکەی بایی ئیشەکەی بێت، نەستەم بکات ونەستەمی لێ بکرێت.
7. پێشەکی کرێ ی بۆدیاری بکرێت ولەپاشان بێ منەت پێ ی بدرێت.
8. ماوەی ئیش کردنی بۆدیاری بکرێت.
9. میری پارێزگاری کرێکەی بکات وکرێکەی نەخوات.
10. ئەبێ ئیش لەتوانای جسمی ولەکاتی دیاری کراودا دەرنەچێت بەڕەغبەتی خۆی ئامادەی ئیشی قورستریان زیاتربووئەبێ یارمەتی بدرێ بۆجسمی لەتواناوبۆکات لەکرێ تابەهرەکێشی و(الاستثمار)وێنەکانی ڕوونەدات.
11. ئەبێ لەسوودی کارخانەکاندا بەگوێرەی ماوەی ئیشی بەشداربێت.
12. ئەبێ ژیانی مام ناوەندی خانەوادەی کرێکار دابین بکرێت وتیمارو خوێندنی منالانی بەلاش بێت.
13. ئەبێ پشودانیان ببێت(وَانَّ لِجسمِكَ عَلَيكَ حَقٌ).
14. ئەبێ لەپاش خۆی میری قەرزەڕەواکانی بۆببژێرێت ومنالەکانی بۆبەخێوبکات.
15. کرێکار پێش وشکەوەبونەوەی عارەقەکەی پێی بدرێت، واتە: لەسنووری باوی خەڵك تێ پەڕنەکات.

ئەمانەکۆمەڵە ئەرکێ بوون کەئیسلام لەسەرشانی میری و خەڵکی داناوەبۆپاداشت دانەوەی کرێکاران لەژیانی دنیادا تاخۆیان وهاوسەرو منالیان بەئاسوودەیی بژین.

**تۆڵەی نەدانی ماف کرێکار:**

سەرەڕای ئەومافانەی کەباسمان کردن ئیسلام زۆرتوڕەیە لەوکەسانەی کەگاڵتەبەماف کرێکارئەکەن وهەڕەشەی توندلەوکەسانە ئەکات کەمافیان پێشێل بکەن لەهەردووژیانداو بەڵێنی سزادانی داوە، سەبارەت بەڕۆژی دوایی ئەفەرموێت(ثَلاثةٌ أنا خَصمُهُم يَومَ القيامة)واتە: سێ بەش هەن کەلەڕۆژی قیامەتدا من دوژمنیانمو ڕووبەڕویان دەوەستم لەبەردەم دادگای خوادا، پێغەمبەری دڵسۆز(ﷺ)ئەفەرموێت: یەکێکیان کەسێکە کەبەکرێکارێك ئیش بکات ولەپاشاکرێکەی پێ نەدات، وەسەبارەت بەسزای دنیا ئەفەرموێت: ( إنا نأخُذُ حَقَّها وَشطرَمالِهِ وَذلِكَ عَزْمَةٌ مَنْ عَزَماتِ ربِّنا)واتە: ئێمەحەقی حوشترەکانی زەکات کەنەیداوە لێ ی وەرئەگرین ونیوەی ماڵەکەش چونکە ئەوماڵەبووەتەهۆی لوت بەرزی وکەللەبایی کابراوماف خاوەن مافانی پێ شێل کردووە وەئەوەیەکێك لەفرمانە نەگۆڕاوەکانی پەروەردگارمانە.

**زانینی هەموو ئیشێك فەرزە لەسەرکۆمەڵ:**

ئاینی پاکی ئیسلام ئاینی خوای خاوەن دەسەڵات وئاگادارە بەسەرهەموپێویستیەکانی مرۆڤدا، ئاشکرایە پێویستیەکانی مرۆڤ زۆرن وهیچ کەس بەتەنیایی ناتوانێت هەموپێویستیەکانی خۆی دابین بکات بەڵکوئەبێ بەخەڵك پێویستیەکانی بێنەدی بۆیە ئیسلام هەموئیشێکی لاپێویستەوزانین وئەنجامدانی هەموئیشێکی پێویست وحەڵاڵ لای فەرزی کیفایەیە کەوابوو ئەبێ هەموئیشێك کەخەڵك پێویستی ببێت ئەوەندە کەس پێ یەوە سەرگەرم بێت کەخەڵك نیازی بەراورد ببێت ئەگینا هەموو خەڵك تاوان بارن بۆنموونە: ئەبێ ئەوەندە بەرگ دروو هەبێت کەکەس پەکی نەکەوێت وەئەوەندە پێڵاو دروستکەر هەبێت کەکەس بێ پێڵاو نەمێنێتەوە هەروەها نانەواونەخۆشخانەو دکتۆروماموستاو بازرگان و..و..هتد. زەوقی جۆراوجۆری خەڵك بۆهەرکام لەوئیشانە بەڵگەی کاربەجێ ی خوای گەورەیەو هەرئەوئیختیلافەیە بۆتە هۆی ئاوەدان کردنەوەی زەوی و بەدەست هێنانی ئەوهەمووشتەبەکەڵکانەی کەئەمرۆ ئەیانبینین. ئەگەر ئیشێکی پێویستی خەڵکی هەبوو کەس نەبوو ئەنجامی بدات وەکو وترا، ئەوخەڵکە هەمووی تاوانبارن تائەوئیشە ئەکرێت بەڵام ئەگەر ئیشەکە ئەنجام درائیتر تاوان لەسەر باقی خەڵکەکە نامێنێ کەئەمە

مانای فەرزی کیفایەیە کەهەندێ جار ئەبێ بەفەرزی عەین وەك ئەوەی کەتەنیا یەك کەس بزانێت بەرگ بدورێت لەوکاتە بەرگ دورین پێویست ئەبێ لەسەرئەوکابرا.

هەمووکەسێك لەوئیشەی خۆیدا گەورەوسەرپەرشتی ئەوخەڵکەیە(سیدالقوم خادمهم)جاوەکو لەپێشەوە وتمان هیچ کەس ناتوانێت بەتەنیای پێویستیەکانی خۆی ئەنجام بدات وەهەموو ئیش کەرێکیش لای کەمی خۆی بەخێوئەکات وبارێکی سەرشانی کۆمەڵ کەم ئەکاتەوە کەوابووئەتوانین بڵێین: هەمووئینسانەکان خزمەتکراوو خزمەتچی یەکترن وکەس لەکەس زیاتر نیە مەگەر بەخزمەتی زیاتر، بۆئەم مەبەستەیە قورئان ئەفەرموێت( انْظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ )الاسراء/ 21، واتە: سەرنج بدەن وبزانن چۆن هەندێکمان بەرزکردووەتەوە بەسەرهەندێکتانابەوماناهێزودەرکی زیادمان داوە بەهەندێکتان ئەتوانن خزمەتی زیاتربکەن ورێزی زیاترتان هەبێت وەیاهەرکەسە بەهۆی ئەنجامدانی ئیشەکەوە کەسودی یەکێکی تری تیاهەیە بوەتەگەورەی ئەوی تر[1] ڕونیشە هیچ کەس توانای بەدەست هێنانی هەموپێویستیەکانی خۆی نیە بەتەنیاکەواتە هەموتان هەریەك لەلایەکەوە گەورەی ئەوی ترن ئەوەیە مانای بەرزایەتی، نەك هەندێك ئەکەین بەئاغاو هەندێك بەنۆکەر، لەپێشەوە وترا کەگەورەی قەوم خزمەتکارەکەیانەجائەم دنیایە جێگای کێ بەرکێ کردنە لەچاکەکردنداو بەرێزترینی مرۆڤ ئەوەیە کەسودی زیاتری بۆخەڵك هەبێت(خَيرُ الناسِ أنفَعُهُم لِلنَّاسِ).

## هەموو ئیشێکی ڕەوا بەرێزە:

لەڕوانگەی ئیسلامەوە خەڵك نابێ پەکیان لەبەرشتێکی پێویست بکەوێت کەوابووهەموو ئیشێکی ڕەوا بەرێزە، بۆنموونە ئەگەر لەناو خەڵکا شوانی بەئیشێکی کەم تەماشا ئەکرێت خۆپێغەمبەری مەزن(ﷺ)ئەفەرموێ(هیچ پێغەمبەرێك نەبووەکەشوانی نەکردبێت)، پرسیاریان لێ کرد(ئەی پێغەمبەری بەرێز تۆیش شوانیت کردووە؟ فەرموی: بەڵێ منیش شوانیم کردووەلەناوقورەیشا لەسەرچەند دراوێك. خۆقورئانیش شوانی هەشت ساڵی یادەساڵەکەی حەزرەتی موسا بەڕونی باس دەکات، حەزرەتی داود ئاسنگەربووەو خواخۆی مامۆستایی کردوەوئەفەرموێت( وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ )السبأ/ 11، واتە: ئێمە ئاسنمان بۆنەرم کردووەوپێمان وت لیباسی زرێی دروست بکەو بائەندازەی هەڵقەکان ڕێك وپێك ووەك یەك بن تابۆشایی نەکەوێتە ناولیباسەکەوەو تیروسەرەرم لێ ی بچنە ژورەوە، حەزرەتی نوح(درودی خوای لێ بێت)باخەوانی ودرەخت نان وتەختەتاشی وکەشتی دروست کردووە، حەزرەتی موحەممەد(ﷺ)بازرگانی وئیشی کردووە بەتایبەت لەدروست کردنەوەی کەعبەدا کەبەردەکانی بەشانی هەڵدەگرت.

حەزرەتی ئیبراهیم وئیسماعیلی کوڕی وەستایەتی(بەنا)وکرێکارییان کردووە بەتایبەت لەدروستکردنەوەی کەعبەدالەوسەردەمەدا. *

حەزرەتی شوعەیب(درودی خوای لێ بێت)حەیوانداری کردووە، حەزرەتی ئیدریس(درودی خوای لێ بێت)بەرگ دووربووە، ئەم ئیشانە بێجگە لەشوانیەکانیان بوو، ئەگەرلەوئیشانەکەئەوپیاوە بەنرخانە کردوویانە ووردبینەوە دەزانین کەئاینی ئیسلام هیچ ئیشێکی ڕەوای بەلاوە سوك وبێ قیمەت نیە، ئەوە نی یە گەورەترین مرۆڤ کەحەزرەتی موحەممەد(ﷺ)بچوکترین ئیش لەڕوانگەی ئێمەی نائاگاوە شوانیە، ئەنجامی داوە.

---

[1] – ڕاستی ئەوەیە کەدەوڵەمەندی وفەقیری هیچیان بەدەست مرۆڤ نیە ئەگەرچی لەم بوارەدا مرۆڤدەورێکی گرنگی هەیە، بەڵکو بنەڕەتی ئیشەکە بەدەست خوایە چ لەڕێری و دەرکەوە بگرەتابەلای ڕەنگاوڕەنگ، ئاشکرایە کەئەگەر ئەوبەرزی ونزمیشە نەبێت یاسای ئەم بونەوەرە ناچێت بەڕێوە بەتایبەت بەشی مرۆڤایەتی، ئەوەیە مانای(لِيَتَّخِذَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا سُخْرِيًّا)الزخرف/32. بەوردی تەماشای باسی(خۆمان وکردەوەکانمان)بکە..

کرێکاران وەختێك کەماندوودەبن ئەگەر سەرنجێك لەپیاوچاکانی ڕابردووی جیهانی خواپەرستی بدەن بەچاکی دەحەسێنەوەوهەستی سەربەرزی وئیفتیخاردەکەن. کرێکاران ئەگەرتەماشای سۆزی ئەوڕەهبەرە گەورەی ئیسلام بکەن( ﷺ)دەزانن چەنددڵسۆزی کرێکارانەدەی برای کرێکار خۆت وویژدانت کام ڕەئیس وسەرکۆماری خۆدانەربەدڵسۆزی کرێکاردەستی کرێکارێکی ماچ کردووەولەگەڵیادانیشتووەوبەسۆزەوە گفتوگۆی لەگەڵ کردووە؟ خۆئەوە تاقانە ڕەهبەری مرۆڤە واتە حەزرەتی موحەمەد( ﷺ)دەستی کرێکار ماچ ئەکات ومژدەی پێ دەداودەڵێ:(دەستەکانت لای خواوپێغەمبەرخۆشەویستن وئەونانەی کەبەودەستانەت پەیدای دەکەیت پاکترین نانە جابۆئێمەش بەدڵێکی پڕ لەئیمانەوەوباوەڕێکی زۆر بەتینەوە خۆمان نەکەین بەسەربازی ئەوڕێبازەوبەهەڵگری ئەوئاڵابەرزوبەڕێزە؟کوا دڵسۆزی لەودڵسۆزتروکوامامۆستایەك لەومامۆستاتروکوازەحمەتکێشێ لەوزەحمەتکێش تر؟ وەکوارێگاوڕێبازێك لەڕێگاوڕێبازەکەی ئەوڕونتر؟ ئەگەربەکرێکار مافێکی هاوتای مافەئیسلامیەکەی پێدراوە لەیاسایەك لەیاساکانی تری جیهاندا هەرکامیان هەڵبژێریت دەخۆیاساکانی جیهان ودەستکردی مرۆڤ تائەمڕۆلەم مەیدانەشدا بەتۆزی قوڵی ئیسلامدا نەگەیشتوون ئیتر چ مانایەکی هەیەدوری لەوڕێبازەو دواکەوتنی ڕێبازو ڕێچکەی ڕوخێنەری مرۆڤ ولابەری خوڕەوشت وسەپێنەری بیروڕایەکی تەسکی چەندمرۆڤێك بەسەرتاقم وگەلێکی زۆردا؟ [3] ئەی براوخوشکی بەناوماف کرێکارەوە هەڵخەڵەتاوخۆتان و ویژدانی خۆتان بکەنبەقازی وخۆتان دادگایی بکەن وبزانن بەلادانەکەتان لەئیسلام مەحکومن یا نە؟ ژیرئەوەیە کەخۆی تەمیەی خۆی بکات(هەڵەش لەهەرکوێدا لێ ی بگەڕێیتەوە قازانجە).

خۆمان وکردارەکانمان دروستکراوی خواین:

زۆر ڕون وئاشکرایە کەهیچ کەس لەدروستکردنی خۆیداخاوەنی هیچ هێزێك نەبووەودایك وباوکیش تەنها هۆیەکن وبەس، چەندین ئافرەت وپیاویش هەبوون وهەن لەتەواوی تەمەنیانانەبون ونابن بەخاوەنی منالێك و دەیان بەڵکو سەدان ئیشی پەسەندو ناپەسەندیش ئەنجام ئەدەن [*]، حەزرەتی ئادەم وحەواوعیسا(درودی خوالەهەموویان بێت)سەلمێنەری ئەوڕاستیەن. ئێمە دروستکراوی خوای خاوەن دەسەڵاتین وکردەوەکانمان بەهۆی ژیری وهێزوتواناوەئەنجام دەدەین کەهەریەك لەوانەش دروستکراوی خوایە، تەنانەت ئەوکردەوانەش کەئەنجامی ئەدەیین نەك تەنیا خۆی بەیارمەتی خواوە نەبێت ئەنجام نادرێت، بەڵکوبەرهەمی کردەوەکانیشمان ئەگەر خوانەیکات بەنسیبمان نابێت، مەگەر نابینی زۆرکەس ئیش دەکات وپارەی ئیشەکەی وەردەگرێت بەڵام پارەکەی وون دەکات؟ ئایاکابرا ڕای لەسەروون کردنی بوو؟ ئەگەربڵێین بابا کاری خۆی بە چاکی هەڵنەگرتبوو وەیا لەبیری چوو، پێ ی ئەڵێین بۆچاکی هەڵ نەگرت ئایا ئارەزووی ون کردنی بوو؟ ئەی چ شتێك وای لێ کرد کەچاکی هەڵنەگرێت؟ خۆی، خەڵك، خوا، کامیان؟ هەرکام بڵێت هەرئەبێ لەئاکامدا بەخوا دوایی بێنێت، وەئەگەرلەبیری چووکێ لەبیری بردەوە؟ هەرچی وەهەرکێ بڵێیت بەنیهایەت ناگەیت تانەڵێیت خوا، لێرەدا ئەگەربپرسن(کەخواشتەکان دەکات ئێمە وەکوچین؟ئێمە ئامێرین بەڵام کەمێ جیاوازە لەوئامێرانەی دەستی ئێمە، ئەوجیاوازیەش پشکی سەربەخۆییەکەخوابەئێمەی بەخشیوەوئێمەلەسەرئەوپشکەیە( الجزْ الاختیاری )سزایاپاداش وەردەگرین واتە لەم ڕوەوەچاکەکان لەنێوان خۆیاندا وخراپەکان لەنێوان خۆیاندا گەورەوبچوکیان نی یە و وەك یەك وان بۆیەپێغەمبەری مەزن( ﷺ)ئەفەرمویێت( لاتَحقِرنَّ مِنَ المَعروفِ شیئاً وَلَوأن تَلقي أخاكَ بِوَجهٍ طَلیق )واتە هیچ شتێکی چاك بەکەم مەزانن ئەگەرچی چاکەکەئەوەبێ کەبەڕویەکی شادەوە ڕووبەبراکەت بکەیت کاتێ کەپێ ی گەیشتیت هەرلەسەر ئەم بناغەیە،

---

* هەندێك بەلایانەوە وایە کەکەعبە لەسەردەمی حەزرەتی ئادەمدا(درودی خوای لێ بێت)دروستکراوەوئێمەیش لەبەربونی فەرموودەیەك، ئەوەمان هەڵبژارد.

2– بۆزیاتر شارەزابوون لەم بارەوە تەماشای نامیلکەی(کێ یاسامان بۆدانێ)بکە.

[3] – مەبەستمان لەڕەواچونەلای دکتۆری خواناسی دادپەروەرو لێزان وپارانەوەی خاوەن باوەڕانەوەمەبەستیشمان لەناڕەواچونەسەرشەخس ونەزەرگەودکتۆری بێ دین وبێ ئەخلاق ولێ نەزانە هەرچەند ووتراوەپێویستی سەرت ئەکات بەماڵی دوژمنا(الضرورات تبیح المحظورات)بەڵام نابێ بۆشیفاوچارەسەری ئەورێگاهەڵانەبگرینەبەر، دکتۆریش هۆیەنەکاریگەر.

زانایان وتویانەتەماشای گەورەوبچوکی تاوان مەکەن، بەڵکوتەماشای ئەوزاتەبکەن کەفرمانی ئەشکێنن وەئەگەر هەندێ ئیشی چاك بەگەورەوگەورەتر وەهەندێ بەبچوك وبچوکتر وەهەربەوپێ یەش تاوانەکان ئەژمێرررێن ئەوەلەڕوویەکی ترەوەیە[4] واتە: تەماشای سوودی ئەوئیشە چاکەدەکرێت بۆخەڵك، بەگوێرەی کەم وزۆری سودەکەی بەگەورەوبچوك دادەنرێت وەهەروەها خراپەیش، جاوەك لەپێشەوە باسمان کرد ئێمە لەسەر ئەوپشکە ئیختیارییە سزا یا پاداش وەردەگرین، چۆن ئەگەرخوا یارمەتی مرۆۋ نەدات، نەچاکەنەخراپە ئەنجام نادرێت، بۆیەپاداشی کردەوە بەستراوە بەنیەتەوە، چونکە پشکی نیەت بەدەست مرۆڤە جائەگەر نیەتی چاکەی کرد باچاکەکەشی بۆنەکرێت، هەرپاداشتی ئەبێت وەئەگەرنیەتی خراپەی کرد وبۆی نەکرا هەرتاوانبارە( انّما الاعمال بالنيّات وانّما لِكُلِ امرٍ مانوى..)واتە: کردەوەکانیان بەنیەتەکانیانە، مرۆڤ هەرئەونیەتەی بۆئەبێ، ئێمەبەندەی خوای خاوەن دەسەڵاتین وکردەوەکانیشمان بێ ئەوپێ ئەنجام نادرێت،( وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ )الصافات / 96 خوائێوەی دروست کردوەوئەوکردارانەش کەدەیکەن واتە، خۆمان وکردارمان مەخلوقی یەك خالیقەکە(الله)یەچونکە ئەگەریارمەتی ئەوزاتە نەبێت ئێمە ناتوانین هیچ شتێك ئەنجام بدەین.

دووەم/ زەراعەت:

لەڕوانگەی ئیسلامەوە ئاوەدان کردنەوەی زەوی‌ئیشێکی زۆر پێویست وڕەواو پەسەندە، چاندنی دانەوێڵەوناشتنی دارو درەخت چ بەردارو چ بێ بەر سودێکی زۆر گەورەو گرنگی تێدایەو هەرشتێکیش سودی زۆری تیابێت بەچاکەیەکی گەورە دەناسرێت، وەلەباسی پێشوودائەوفەرموودەی پێغەمبەرمان(ﷺ)باس کرد کەئەفەرموێ: هەرکەسێك درەختێکی بەردار یادانەوێڵە بچێنێ، هەرگیان لەبەرێك هەرچەنێکی لێ بخوات هۆی خۆشبەختی خاوەنەکەیەتی، چونکە بەچاکە بۆی ئەنوسرێت وە وتراوە ئەگەرنەمامێکتان بەدەستەوەبوو خەریکی ناشتنی بوون، پێ یان وتن هەرئێستا ئەمرن، نەمامەکە فڕەنەدەیت بەڵکو بینێژی وەك فارس ئەڵێن(دیگران کاشتن ماخوردیم ماهم میکاریم دیگران بخورند).

زەوی هی کێ یە؟

زەوی موڵکی خوایەو بەوکەسە دەدرێت کە لەپێش هەمووکەسێکدائاوەدانی بکاتەوەو بەسەریابگات وەدروست نیە ئەوزەویە لەسێ ساڵ زیاتر بایەربمێنێتەوە، هەرکەسێك لەموڵکی کەسێکدا درەختێك یاخانویەکی دروست کرد ئەوا بەزۆرلێ ی ئەسێنرێتەوەوهیچ حەقێك بەستەم کار نادرێت وەك پێغەمبەری مەزن(ﷺ)ئەفەرموێت( مَنْ أحيا أرضاً مَيتةً فَهيَ لهُ وَلَيسَ لِعرقِ ظالِمٍ أجرُ )واتە هەرکەسێك زەویەکی پاك کردەوەوبەسەریا گەیشت ئەواهی خۆیەتی وەبۆدرەختێك کەبەناڕەوالەوزەویەدابنێژرێت هیچ مافێك نیە. کەسێك ئەگەرنەیتوانی زەویەکەی بکێڵێ وسودی لێ وەرگرێت پێویستە بیدات بەبرایەکی ئاینی خۆی وەهیچی لێ وەرنەگرێت چونکە پێغەمبەری مەزن(ﷺ)ئەفەرموێت( اذا كان لاحَدِكُمْ أرضُ فَليمنَحها أخاهُ أوليَزْرَعها)واتەئەگەر یەکێکتان زەویەکتان هەبوو بابیبەخشن بەبراکەتان یاخۆتان بیکێڵن، لەم فەرموودە بەنرخەوە دەرئەکەوێت کەنابێ زەوی بەبایەری بهێڵرێتەوە بەڵکو یائەبێ خۆی بیکێڵێ یا ئەبێ بیدات بەخەڵك، ناڕەوایە زەوی بدرێت بەکابرایەك بەشەریکی ئیتر تۆوەکە لەسەرکابرابێت یا لەسەر خاوەن زەوی چۆن فەرموودەی پێشوو ئەوڕاستیەی ڕوون کردەوەولەفەرموودەیەکی ترداهاتووەکە( نَهَى عَنِ المُزَارَعَةِ )ئەم بەکرییەش بەریاسای(*سد الذريعة*)، ئەکەوێت چونکە زۆروادەبێت کەلایەنێك فێڵ لەلایەنێکیان بکات وکابرای ئیشکەر تەماع هەڵی نێت لەسەردزین ولاخستنی هەندێك لەوبەرووبومە، جابۆئەوەی کەئەوڕێگابگیرێت ئیسلام تەنیا سێ ڕێگابەڕەوا دەزانێت لەم بارەوە:

---

4 - چاکەوخراپە دووڕویان هەیە، یەکەم/بەنیسبەت خواوە، دوهەم/بەنیسبەت خەلکەوە، یەکەم گەورەوبچوکی نیەچونکە فرمانی خوات شکاندووە بەلام، بەشی دوهەم تەماشای زیانی گەورەوبچوك یاسودی گەورەوبچوك ئەکرێت وبەوشێوەچاکەوتاوان بەبچوك گەورە ناوئەبرێن.

1. خۆی زەوی یەکە بکێڵێت وسودی لیٚ وەرگرێت.
2. بیبەخشێت بەبرایەکی ئاینی تابراکەی سودی دنیایی لیٚ وەرگرێت ئەویش سودی ڕۆژی دوایی دەست دەکەوێت(مَن جاْ بالحسنة فله عشرُ امثالها)واتە هەرکەسێك چاکەیەك بکات دەبەرانبەری هەیە.
3. بەقیمەتێکی دیاری بیدات بەکەسێکی تر، ئەمیانە دواترین پلەی ئینسانیەت وکەمتەرخەمیەتی سەبارەت بەخواو خەڵك.* هەرچەند بۆئەمڕۆئەگەرئەم پلەی سێیەمەیش بەکاربێت هێشتا هەرباشە نەك ڕێگا گومان لێکراوەکانی تربگرێتەبەر.

خواردنی میوەی باغ:

نەهاوبەشی وەنەموڵکێتی تاك لەئیسلام دا بیٚ سنوور نیە، دروستە هەرکەسێك بدات بەناوباغی کەسێکدا لەمیوەی ئەوباغەبخوات بەڵام نابیٚ بەشی دوایی لیٚ هەڵگرێت، پێغەمبەری مەزن(ﷺ)لەم بارەوەئەفەرموێت(مَن أصابَ مِنهُ مِنْ ذی حاجةٍ غَیرِ مُتَخِذٍ خُبنَتةً فلا شیْ علیهِ)کەسێکی موحتاج ئەگەرمیوەیەکی لەباغێکداکردەوەو لەناوباغەکەدا خواردی وهیچی لەگەڵ خۆیدانەبرد ئەواهیچی لەسەرنیە واتە(ئیشێکی ناڕەوای نەکردووەوپشکی هاوبەشی خۆی خواردووەوخاوەن باخیش سودی ڕۆژی دوایی بۆدەمێنیٚ وبیٚ منەت ناکرێت.[5]

ئاودێران

باغی خورما وتریٚ دروستە بدرێت بەکابرایەك بۆئاوەدان وسەرپەرشتی کردنی ولەبەرهەمەکەیدا شەریك بن وەئەگەر زەویەکەش لەناو ئەودارخورماو باغە تریٚ دا بوئاوەدانی باغەکە بەبیٚ ئاوەدانی زەویەکە نەدەکرایازۆر زەحمەت بووبۆئەمە دروستە بدرێت بەکابرای ئاودەروخاوەن زەوی و ئاودەرلەبەرهەمەکەیدا شەریك بن بەومەرجە تۆوەکە لەسەرکابرای خاوەن زەوی بێت[6] وەئەم شەراکەتە ئەگەر لەسەرنیوە بێت چاکترو ڕێکترە، وەئەگەرکەمتربیٚ مادام هەردوکیان ڕازی بن قەیناکا، بەڵام باغی میوەکانی ترچونکە زەحمەتێکیش ئەوەندە سودی گرنگی دەست ناکەوێت، نابیٚ بەشەریکی لەبەرهەم دائاوبدرێن، دەبیٚ بەکریٚ بێت وئەوەبەسودی کرێکارە.

سێهەم/ کڕین وفرۆشتن

کڕین وفرۆشتنی هەرشتێکی پاك وبەسودولەبەرچاو بێت یاوابێت کەبەتەعریف بناسرێت دروستە، مادام فێڵ وفڕی تیانەبێت ئیشێکی زۆربەنرخ وپیرۆزە لەڕوانگەی ئیسلامەوە، پرسیارکرا لە پێغەمبەری پایەبەرز(ﷺ)کام ئیش چاکترە؟ فەرمووی( عَملُ الرّجُلِ بِیَدهِ وکلُّ بَیْعٍ مَبرورٍ أی لاغشّ فیه ولاخیانةَ) چاکترین کەسابەتی مرۆۋ ئەوەیە کەبەدەستی خۆی بیکات و وەهەموکڕین وفرۆشتنێکی ڕەوا کەفێڵ وفڕی تیانەکرێت.

سوخواردن قەدەغەیە

یاسا پاك وبێگەردەکەی ئیسلام سورە لەسەردابینکردنی خەیرو خۆشی بۆهەمووخەڵك، لەبەرئەوە هەمووشتێکی چاك وپاك پەرە پیٚ ئەداو هەمووشتێکی خراپ وبەزیان قەدەغە دەکات، یەکێك

لەوشتەناپەسەندانەسوخواردنە(الربا)لەڕێگەی مژینی خوێنی چەوساوانە لەلایەن سەرمایەدارانەوە بەڵگەی بیٚ بەزەیی و دڵڕەقی گەلەلەناو خۆیدا بۆیە ئیسلام زۆر توڕەیە لەو کردارە ناپەسەندەو بەتوندی هێرش دەکاتە سەریان وئەفەرمویٚ(لَعَنَ رسول الله آکِلَ ومَوَکِلهُ وَکاتبَهُ وَشاهِدَیهِ )واتە پێغەمبەری خوا(ﷺ)نەفرینی کردووە لەسوخۆرو سودەرو نوسەرودووشایەتەکەی.

سوخواردن هەروەکو خوێن مژینی چەوساوانە، سوخۆری هۆی کۆبونەوەی ماڵەلەدەست سەرمایەداراندا کە ئاشکرایە ئیسلام بەتوندی دژی ئەوڕەوشتە ناپەسەندەیەوبەڵێنی سزای سەختی داوە بۆئەو دووکۆمەڵە خوای گەورە سەبارەت

* بۆچی بەرگری لیٚ ناکرێت تەماشای باسی(لەبەررژدی زۆر نیە)بکە.

5– بۆچاکترڕونبونەوە لەوەی کەزەحمەتی هیچ کەسێك بەزایەناڕوات تەماشای(باسی سامان لەئیسلاداو ئیسلام کەس بیٚ منەت ناکات)بکە.

6 – لێرەدا بۆیە ئەوئیشە بەڕەوادائەنرێت چۆن بەرژەوەندی هەردوولەوەدایە ئیشەکە ناچاری یەو بەریاسای(الضرورات تبیح المحظورات)ناچاری قەدەغەکان ئیجازە ئەدات) ئەکەوێت.

بەسوخۆران ئەفەرموێ( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ (278) فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِنْ تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُءُوسُ أَمْوَالِكُمْ لَا تَظْلِمُونَ وَلَا تُظْلَمُونَ )البقره/ 278-279،ئەم ئایەتەکاتێ هاتە خوارەهەندێك لەمسوڵمانان لەسەرعادەتی پێشو کەسوخۆری باوبوو هێشتا هەرخەریك بوو، خوای گەورەفەرمووی ئەی خاوەن باوەڕان لەخوابترسن ووازبهێنن لەسوەکانتان ئەگەرخاوەن باوەڕن، ئەگەروازناهێنن دەی بانگەوازی شەڕلەگەڵ خواوپێغەمبەرەکەیدابکەن، وەئەگەروازتان هێنا، ئەوەبنەمایەکە(رأس المال)هی خۆتانە، نەستەم بکەن بەسوووەرگرتن لەخەڵك ونەستەمیشتان لیّ بکریّ بەنەدانەوەی بنەمایەکتان. لەم ئایەتە پیرۆزانەوەدەرئەکەویّت ئەگەر سوخۆرواز نەهێنیّ نەتەنیا سو وەکەی پیّ نادریّت بەڵکو بنەمایەکەیشی پیّ نادرێتەوە وشەڕیشی لەگەڵدا دەکریّت تاوازی پیّ ئەهێنرێت لەوخوێن مژی وبیّ ڕەحمییە. سوخۆری یەکێکە لەوحەوت گوناهەگەورە کەئەبنەهۆی فەوتان وسزای سەختی قیامەت، سوخۆری پەیوەندی ڕاستەخۆی بەڕەوشتەوە(الاخلاق)هەیەو ڕەوشتیش چ خراپ وچ چاك لەهیچ یاسایەك لەیاساکانی ئاسمانیدا نەگۆڕاوەوناگۆڕێت، ئەوەتە هەرسەبارەت بەم خووە ناپەسەندە خوای گەورە سەرکۆنەی جولەکەکان ئەکاوئەفەرمویّ( وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُوا عَنْهُ )النساء/ 161وەبەهۆی سوخۆریانەوە کەبەڕاستی قەدەغەکرابوون لەوسوخۆریە، واتە یەکێك لەوهۆیانە کەبوبەهۆی ڕقی خوا لەجولەکەکان سوخۆری بوو.

## جۆرەکانی سوخۆری

بەکورتی سوخۆری ئەتوانین بڵێین دووبەشە:

1. سوخۆری لەکڕین وفرۆشتنی دووشتی وەکو یەك وزیادە وەرگرتن یایەکێکیان حازرنەبیّ.
2. سوخۆری بەهۆی قەرزەوە بەوشێوە پارەیە بدریّت بەقەرز بەڵام کاتی وەرگرتنەوەی لەبەرئەوە قەرزبووە زیاتر وەرگیریّ یاشتێك بفرۆشیّ لەبەرئەوەی کەقەرزە بەزیاتر دابنرێت.

جابۆئەوەی توشی ئەوتاوانە گەورە نەبین هەرشتێکمان بەوێنەو چەشنی خۆی فرۆشت پێویستە ئەم سیّ مەرجەی تیابێتەجیّ:

1. هەردوکیان حازربن.
2. لەکەم وزیادیدا وەك یەك بن.
3. ئەبیّ تەسلیم کردن ووەرگرتن لەیەك کاتابن. بەڵام ئەگەر جۆرەکەیان لەیەك جیابوو تەنیا دوومەرج پێویستە واتە(یەکەم وسیّ هەمی سەرەوە). زیادەوەرگرتنی لایەنێك لەم شێوەیەدا بەسوخۆری ناژمێررێت، پێشەوای مەزن ودڵسۆزی بەرەی ئادەمی پێغەمبەری پایەبەرز( ﷺ )لەم بارەوە ئەفەرموێت( الذَّهَبُ بالذَّهَبِ وَالفِضَّةُ بالفِضَّةِ والبُرُّ بالبُرَّ وَالشَّعيرُ بالشَّعير وَالتَّمرُبالتَّمرِ وَالمِلحُ بالمِلحِ مِثلاً بِمِثل سَواً بسَوٍا يَداً بيَدٍفاذا اختَلَفَتِ الاجناسُ فَبيعُوا كَيفَ شِئتُم اذا كانَ يَداً بيَدٍ)

واتەئاڵتون بەئاڵتون وزیو وگەنم بەگەنم وجۆ بەجۆ وخورمابەخورماو خویّ بەخویّ ئەبیّ وەك یەك ودەست بەجیّ بن بەڵام ئەگەر جۆرەکەیان لەیەك جیابووئەوەهەرچەندزیادوکەمیان ببێت دروستە بەومەرجەی هەردوولادەبێت دەست بەجیّ وەری بگرن، دیسان پێغەمبەری مەزن( ﷺ ) ئەفەرموێت( دِرهَمُ رِباً يأكُلَهَ ابنُ ادم أشَدُّعِندَ الله اثماً مِن سِتٍ وَثلاثينَ زَنيَّةً )واتە: یەك درهەم کەبەنی ئادەم بەسوبیخوات تاوانی گەورەترە لەلای خوا لەسی وشەش زینا، دووهەمیان ئەفەرموێت( لِلربا سَبعُونَ باباً ايسَرُهامِثلُ ان يَنكِحَ الرَّجلُ أمَّهُ )واتە: سوخۆری حەفتا جۆر تاوانی هەیە سادەترینیان وەك زینای دایکی خۆی وایە، بەڵیّ بەڕاستی خواردنی سوو ڕەوشتێکی زۆرناپەسەندەو هۆی بڵاوبونەوەی چەندین بیماریە وەك دروستکردنی دوژمنایەتی وزۆربوونی حەسادەت وکیّ بەرکیّ کردنی خەڵك بۆکۆکردنەوەی سامان بەهەرشێوەیەك کەبۆیان بکریّت تاخۆیان لەوخوێنمژانە ڕزگارکەن ولەپاشا جێگای ئەوان بگرنەوەودەیان ڕەوشتی تری ناپەسەند، بەڕاستی سوخۆری ڕەوشتێکی ناپەسەندو نالەبارەو لەتاوان دا کەم وێنەیە، ئەڵێن جارێك کابرایەك

کابرایەکی سەرخۆشی دی کەشەو لەدەشت وچۆڵیەکدا بەشوێن مانگادا ڕای ئەکرد کەبیگرێت!! کابراکەدی تەڵاقی خوارد کەهیچ شتێك لەوەپیسترنی یە، لەپاشا چووە لای ئیمامی مالیك(خوالیٚ ی خۆشبیٚ)وپرسیاری تەڵاقەکەی کرد کەئایاشت هەیە لەوە پیستر یا نەء؟

ئیمامی مالیك فەرمووی بچۆبەیانی وەرەوە، کابراکە بەیانی هاتەوە ئیمام فەرمووی تەڵاقت کەوتووە، چونکە من شەوڕۆژ سەرنجی قورئان وحەدیسم دا نەم دی هیچ شتێك بەئەندازەی سوخۆری پیس بیٚ چونکە خوای گەورە دژی سوخۆران داوای بانگەوازی شەڕی کردووەمەبەستی ئایەتی( فَأْذَنُوا بِحَرْبٍ مِنَ اللَّهِ )البقرە/279بوو لەپێشەوە باسمان کرد حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ)ئەفەرمویێت لەبازاڕەکانماندا نابیٚ کەسابەت بکەن تاشارەزای کڕین وفرۆشتن نەبن لەئیسلامدا، ئەگینا توشی سوخۆری ئەبن هەروەهاحەزرەتی عەلی(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ)ئەفەرمویٚ(هەرکەسێك خەریکی بازرگانی بێت بەرلەوەی شارەزای ئاین ببێت سەبارەت بەکڕین وفرۆشتن، دوچاری سوئەبێت، دوچاری سوئەبێت واتەدووجارفەرمووی.

براوخوشکە مسوڵمانەکان، ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆدابین کردنی خۆشبەختی مرۆڤ ئەوەندەدژی ئەوئەخلاقە ناپەسەندانە دەوەستێت زۆرحەیفە بۆئێمە کەئەوئاینە پاك وخاوێنەی خۆمان نەناسین وهەوڵی بۆنەدەین وپەیڕەوی لێوەنەکەین بەڵکوکوردواتەنی دوای کڵاوی بابردووبکەوین.

کیٚ بەرگری دەکرێت؟

ئەوانەی کەلەماملەدابەرگری دەکرێن ئەمانەن:—

1. شێت چونکە قازانج وزیانی خۆی نازانیٚ.
2. ئەوکەسەی کەقەرزی زۆری خەڵکی لابیٚ وئەوەندەی نەبێت کەبیان بژێرێت.
3. منالٚ، چونکە ئەمیش لەسەرفکردنی ماڵدا دەرکی سوود و زیان ناکات تاماڵەکەی بەهەوانتەنەڕوات وکۆمەڵیش لیٚلٚ ولیخن نەکات کەهەندێك بکەونەتەماعەوەوبەفێلٚ وفرشتی بەهەرزان لیٚ بکڕن یان بەگران پیٚ ی بفرۆشن.
4. ئەوکەسەی کەماڵی خۆی بەفیڕۆخەرج بکات، هەرچەندبەرگری پاش باڵغ بوون هەندیٚ کێشەی لەسەرە بەڵام من ئەم ڕەئیەم پیٚ پەسەندترە.

تیٚ بینی

وەسیەت کردن بەزیاتر لەسیٚ بەشی ماڵ مەنع دەکرێت مەگەرخاوەن بەشەکان ژییرو باڵغ بن و ئیجازە بدەن.

چەندئاگادارییەك

1. ئاودێران لەیاسای کڕین وفرۆشتن دەرئەچێت چونکە فرۆشتنی شتێکی نادیارییە کەبەری خورماو مێوەکەیەو هێشتا دەرنەکەوتووە، بەڵام چونکە زۆرکەس هەیە باغی گەورەی خورماو تریٚ ی هەیەو خۆی نازانیٚ یاناتوانیٚ خزمەتی بکات وهەندێکیش هەن کەدەزانن و دەتوانن، بەڵام باغیان نی یە لەبەرئەوەیاسای ئیسلام ئەوئاودێران وخزمەتە لەسەرخورماو ترێیەك کەهێشتادەرنەکەوتوون ئیجازەئەدات.
2. ئیجازەی بازرگانی بەماڵی خەڵك دراوەبەمەرجێك لەسودوزیانداهاوبەش بن وئەم بەشەش لەپەڕاوەفیقهیەکاندا بەدرێژی بەناو(قیراض)ەوە باس کراوە.
3. ئیجازە دراوە کەخاوەن قەرزێك قەرزی بەڵاتەوەیە بینێری بۆلای کەسێك کەقەرزی تۆی بەلاوەیەئەمەش پیٚ ی ئەوترێت ڕەوانەکردن(حوالە).
4. ئیجازەدراوە کەخورمای تازە پێگەیشتوو( الرطب )بدریٚ بەخورمای لەدەستابو بەمەرجێك نەگات بەحەدی زەکات ئەمانە هەموویان لەبەرئیحتیاجی زۆری خەڵك وناچاری ئیجازە دراون وناکرێن بەقیاس بۆشتی تر، ئەمانە نیشانەی بەربڵاوی یاسایەوداگیرکردنی هەموکون وقوژبنێکی ژیانە(العموم والشمول).

قەرزدان سونەتە

قەرزدان بەئینسانی موحتاج مادام بۆگوناهی نەبێ وداوای بکات پێویستە بەڵام ئەگەربۆگوناهی بوو ئەوەئەوقەرزدانە قەدەغەیەو وەئەگەرگومانی تاوانی لێ دەکرا، چاك وایە قەرزی پێ نەدرێت چونکە کابرا بەرەفتارە ناشیرینەکانی ماڤ خۆی سوتاندووە.

لەبەرسوری ئیسلام لەسەرقازانجی خەڵك، قەرزدانی بەلاوە زۆرشتێکی جوانەو هەندێ جاریش بەپێویستی دەزانێت( وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلا تَعَاوَنُوا عَلَى الأَثْمِ وَالْعُدْوَانِ )المائدە/ 3 واتە: یارمەتی یەکتربدەن لەسەرچاکەو خواپەرستی ویارمەتی یەکترنەدەن لەسەرتاوان ودوژمنایەتی. کابرای قەرزار نابێ کاتی بونی کەمتەرخەمی بکات لەبژاردنەوەی دا، چونکە پێغەمبەر(ﷺ)ئەفەرموێ(مَطَل الغَنِي ظُلمٌ)واتە نەدانەوەی قەرزلەکاتی بونا بەخاوەنەکەی ستەم وزوڵمە. قەرزدان چاکەیەو لای خواری پاداشتەکەشی هەژدەبەرامبەرە بەڵام لای خواری چاکە دەبەرامبەرە چونکە دەگونجێ کابرای چاکە لەگەڵ کراوشتێکی هەبێ بەڵام ئەوەی موحتاج نەبێ داوای قەرزناکات هەروەها چاکە ئەبێتە هۆی کەمتەرخەمی وگوێ نەدانە زەحمەت وئیش لەلایەن چاکە لەگەڵ کراوداو تەمەڵی لێ پەیدا دەبێت، بەڵام قەرز ئەبێتەهۆی خستنە کاری کابرای قەرزار چونکە دەبێ هەوڵ دات بیبژێرێتەوە، وەئەگەر کابرای قەرزار لەبەرکەم دەستی قەرزەکەی بۆنەئەدرایەوە پێویستە لەزەکات قەرزەکانی بۆبدرێتەوە، واتە ئیسلام مادام داوای قەرز ئەکات ئامادەیە لەکاتی نەبونی دەسەڵاتی قەرزارەکەدا تائەوجێگایە بۆی بلوێت ئەوقەرزە ببژێرێت وبۆهەمیشەیش بەشێکی زەکاتی داناوەبۆئەوانە(وَالْغَارِمِينَ) واتە: قەرزداران یەکێکەلەوهەشت تاقمەزەکات بەرانە جائەگەر میری ویارمەتی خەڵك قەرزەکانی بۆتەواو نەدەبوو پێویستە خاوەن قەرزەکانیش دەست لەباقیەکەی هەڵگرن، ئیسلام ئەوقەرزە بەئیشێکی چاك وئینسان دۆستانە ئەزانێ وهۆیەکە بۆپەیدابونی دۆستایەتی وخۆشەویستی لەنێو خەڵکا بۆیە نەرێگا بەماتەڵ کردنی قەرزەکە ئەدات ونەئیجازە ئەدا شتێکی زیاتر یاچاکترلەقەرزارەکە وەرگیرێت وئەوئیشە بەسوخۆری دائەنێ ئەوحیسابەی بۆدەکات کەلەباسی سوخۆری دا باسمان کرد، بەڵام ئەگەر لەم بارەوە هیچ مەرجێك نەگیرابوو لەپاشا قەرزارەکە ماڵێکی زیاتریاچاکتری هێنایەوە بۆخاوەنەکەنەخراپی نەکردووەبەڵکو ئیشێکی چاکی کردووە، پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ)لەم بارەوە ئەفەرموێ(انَ خيارُكم أحْسَنُكم قَضاً)واتە چاکترتان ئەوکەسەیە کەقەرزباشترئەداتەوە وەچونکە چاکەی لەگەڵا کراوە، جەزای چاکە، چاکەیە( هَلْ جَزَاءُ الاحْسَانِ إِلا الاحْسَانُ )الرحمن/ 60. ئەمەیش بۆیە ئیجازەدراوە چونکە ئەبێتە هۆی بەتین بونی پەیوەندیەکان و باوەڕبونی زیاتر بەیەك وبەرزو بەهێزبونی پلەی خۆشەویستی لەنێوخەڵکدا، ئەوەیە ئاینە ئاشتی خوازومرۆڤ ویستەکەی ئیسلام هەمووکون وقوژبنێك دەگەڕێ بەدوای ئیشەچاکەکانداو کۆیان دەکاتەوەو پێشکەش بەکۆمەڵی خەڵکی دەکات وبەتوندی دژی خراپەکان لەناوکۆمەڵ دادەوەستێت وتاریان دەنێ، ڕاستی ئەوەیەیاساکەی قورئان، هێنەری خەیرە بۆهەمووجیهان. هەرکەس لێ ی لادا خۆی زەرەر دەکا، بێجگە لەسەرشۆڕی هیچ بەهیچ ناکا قسەی بێ ناوکەبو بۆڕووس پێی هەڵگرا بەڵام زۆری پێ نەچوودەهۆڵەکەی دڕا.

ئەوشتانەی کەهەمووتیاشەریکین

هەمووکان وسەرچاوەکانی وەك نەوت، قیر، خۆی ئاڵتون و زیوئاسن ومس گازو وێنەکانیان نابێ بدرێن بەدەست یەك یاچەند کەسی تایبەتیەوە بەڵکو ئەبێ میری دەستیان بەسەرا بگرێت وبەکرێ ئەوشتانە ئەنجام بدات وبەرهەمەکەی بۆتەواوی خەڵك بێت ئەمەش یەکێکە لەوبەڵگەڕونانە کەئیسلام بەسەرمایەداری پەڕوباڵ وقورس ڕازی نیە وماوە بەسەرمایەداران نادات کەدەست بکێشن بەسەر ئەوکان وسەرچاوانەدا، تەنانەت میریش ناتوانێت یەکێك لەوسەرچاوانە بدات بەدەست یەك یاتاقمێکەوەبۆخۆیان بەڵکوئەبێ ئەوکان وسەرچاوانە لەبەرژەوەندی گشتی دا

بەکاربهێنرێن، پێغەمبەری مەزن( ﷺ )ئەفەرموێ(ئینسانەکان باوەڕداروبێ باوەڕ هاوبەشن لەسێ شتا لەئاووئاگرولەوەڕدا)لەفەرمودەیەکی ترا ئەفەرموێ لە(خوێ)واتە ئەوشتانەی کەهەمووکەس بۆخۆی یابۆمەڕومالآتی ئیحتیاجی پێ ی هەیە دەبێ گشتی بێت نابێ تایبەتی کرێت بەیەك یاتاقمێکەوە.

سەلەم

سەلەم، کڕین وفرۆشتنێکە کەفرۆشراوەکە لەڕونەبێت ولەوانەبێ کەبەتەعریف بناسرێت وماوەش بۆوەرگرتنی هەبێت سەلەم ئەگەرچی بەڕواڵەت لەسودەچێت، بەڵام لەبەرپێویستی خەڵك وناچاری ماوە بەوئیشە دراوە، قازانجی سەرمایەدارەکە لەم وێنەیەدا سەداسەدنیەتاوەکوسوی(الربا)لێ بێت ئەگەرچی قازانجەکەی بەرچاوترە، سەلەم بێجگەلەوەئەبێ سەلەم کراوەکە شتێکی بەسودوپاك بێ چەندمەرجی تربۆسەلەم پێویستە وەئەبێ ئەومەرجانە بێنەدی ئەگینا دروست نی یە.

1. ئەبێ پارەکەلەکاتی دابەستنی سەلەمەکەدا تەسلیم کرێت.
2. ئەبێ سەلەم کراوەکە قەرزبێت.
3. ئەبێ جێگاوکاتی تەسلیمکردنەکەی دیاری بکرێت.
4. ئەبێ سەلەم کراوەکە بتوانرێت تەسلیم بکرێت.
5. ئەبێ سەلەم کراوەکەبەرێگای عادەتی دیاری بێت واتە(ئەندازەکەی بەپێوانە یاکێشانە یاژمارە یامەتر دیاری کرێت).
6. ئەبێ ئەوسیفەتانەی کەنرخ ورەغبەتی خەڵکی تیادەگۆڕێ لەسەلەم کراوەکەدا ئەبێ دیاری کرێ وبزانرێت بێجگە لەو وەسفەی کەشتەکە نایاب کات ئەمەهەموو بۆئەوەیە کەخەڵك دوچاری هەراو دەمەقاڵە نەبن، ماوەدان بەسەلەم شتێکی پێویستە بۆژیانی خەڵك بۆیە ئیسلام بەڕەوای داناوە کەوابوهەروەسفێك شتەکەی سەخت کرد یاکەم کردنەوەی هەرمەرجێك لەومەرجانە کەباسکران ئەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی سەلەمەکەچونکە ناکۆکی لێ پەیدا ئەبێت.

برای مسوڵمان وخوشکی خواناس وبەئیمان تەماشاکەن کەڕێبازەپیرۆزەکەتان چەندسورە لەسەر دابین کردنی ژیانی ئینسان بەشێوەیەکی ڕێك وپێك ولەهەرگۆشەیەکەوە خەیرێ هەبێت هێناویەتی ولەبەردەم خەڵکادایناوەو هەرخراپەیەك بەدی کات بەگورزوگۆپاڵ ڕاوی دەکات ڕاستی فەرمووە خوای گەورەکەئەفەرموێت( وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ)الانبیاء/107 واتە ڕەوانەکردنی تۆئەی موحەممەدبۆهیچ شتێك نیە مەگەربۆ دابین کردنی خەیروبەرەکەت بێ بۆهەمووخەڵك. درودوڕەحمەتی خوات لێ بێ ئەی پێغەمبەروئەی دڵسۆزوپێشەواوڕەهبەر. ئیسلام مەنع ئەکات غەش لەمامەڵە، بەبێ ئیسلام جیهان ئیشی ماتەڵە.

ئەوەی چاکەبێت یاسای ئیسلامە کامیش خراپەبێ دژی ئیسلامە.

کێ ئەڵێ وانیەدەستی باڵاکا، پەنجەی دابنێت لەسەرتاقە خاڵێکیا.

بەخشین وخەڵات

بەخشین وخەڵات بەوشتەدەوترێت کەبەبێ شت وەرگرتن لەباتی دا بدرێ بەکەسێك ئەم بەخشراوەئەبێتە ماڵ بۆکابرای پێ بەخشراو.

بەخشش وخەڵات لەڕوانگەی ئیسلامەوە چۆن هۆیەکە بۆخۆشەویستی ودۆستایەتی ئیشێکی ڕەواوچاکە لەهەرکەسەوەبێت وهەرچەندبێت، پێغەمبەری مەزن( ﷺ )دیارییەکەی موقەوقسی کافری وەرگرت و ماریەی قبگی دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر( ﷺ ) یەکێك بوولەودیاریانە، دیاری هەرچەندبێت نابێ بەسوك تەماشابکرێت چونکە دیاری هۆی خۆشەویستی وبەتین کەری پەیوەندی نێوان خەڵکە کەوابوو هەرشتێ ئاوابێ زۆربەنرخە ئەگەرچی خۆی شتێکی کەم نرخ بێت بۆیەپێغەمبەری دڵسۆزوری پیشاندەر( ﷺ )ئەفەرموێ( لاتَحقِرَنَّ جارةُ لِجارتِها

وَلَوفِرسَنَ شاةٍ )واته ئاومالّیك دیاری ئاومالّەكەی خۆی بەكەم نەزانیّ ئەگەرچی سمی حەیوانیّك بیّت، ئیسلام ئاینی برایەتی ویەكیّتی وخۆشەویستیە وبەتین كەری پەیوەندی نیّوان خەلّكە، دیاریش هۆیەكە بۆپەرەپیّدانی ئەم شتە بەنرخانەوهەرهۆیەك كەببیّتە گومان ونابەدلّی دیارییەكە، نرخی ئەوبەخشینە دیّنیّتە خواروئیسلام بەرەوای نازانیّت وەك ئەم خالاّنەی خوارەوە:

1. سەندنەوەی دیاری لەروانگەی ئیسلامەوە شتیّكی ناپەسەندو قەدەغەیە پیّغەمبەر( ﷺ)ئەفەرمویّ( الَّذی یَعُودُفي هِبَتِهِ كَالكَلبِ یَرجِعُ الی قَیئِهِ )ئەوكەسەی كەخەلاّتی خۆی دەسیّنیّتەوە وەكوسەگیّك وایە كەبگەریّتەوە بۆخواردنی ریشیانەوەی خۆی. چونكە ئەمەلەباتی دۆستایەتی ناریّكی ودوژمنایەتی زیادئەكات.

2. دیاری بۆكاربەدەستانیّ كەلەپیّش كاربەدەستیا شتیّكی والەنیوان ئەوكاربەدەستەودیاری دەرەكەدا نەبوبیّ، چونكە ئەمە ئەبیّتە هۆی گومانی خراپ بۆهەردولا.

تیّ بینی

دیاری بەناوبەرتیلەوە تاوانیّكی گەورەیەو پیّغەمبەری خوا( ﷺ)نەفرینی لەبەرتیل دەرو وەرگرو واسیتەی نیّوانیانی كردووە. مسوڵمانان ئەبیّ ئاگاداری خۆیان بن وخۆیان دوچاری ئەونەفرینە نەكەن لەبەرشتیّكی دواكۆتای دونیا.

1. دیاری لەرودامان(غصب الحیأ )واتە كابرا لەشەرماندا شتەكە ببەخشیّت، وەك ئەوەشتیّكی بەقیمەت یاجوانی هەیەو كابرایەك تەماشای ئەكات وئەلّیّ شتیّكی جوانەو چاكەوخاوەنەكەی پیّی شەرمە ئەگەرنەلّیّ پیّشكەشت بیّ ئاشكرایە ئەوپیّشكەشیە نابیّ وەرگیریّت چونكە پیّشكەشی لەرودامانەو بەدلّ بەوبەخشینە رازی نیە ئیتر كەی دۆستایەتی دیّنیّت؟

2. دیارییەكە ببیّتە هۆی یارمەتی لەسەرتاوان( )المائدە/ 2براوخوشكی مسوڵمان، ئەوەیە یاساورێبازەكەت تەماشاكەن چەندسورە لەسەرهیّنانی هۆیەكانی خۆشەویستی وبرایەتی ودورخستنەوەی هۆیەكانی ناكۆكی ودوژمنایەتی.

نان خواردنی دەعوەتی

لەروانگەی ئیسلامەوە دەعوەت بۆنان خواردن ومیّوان داری دووشتی جیان لەیەك لەبەرئەوە پیّویستە هەریەكەیان بەجیا باس بكریّت.

1. دەعوەت بۆنان خواردن چونكە هۆی زیاد بونی خۆشەویستی وبرایەتیەئیشیّكی چاكی ئیسلامەوپیّویستە دەعوەت كراو بچیّتە سەردەعوەتەكەو نابیّ خۆی ببویّریّت مادام لەوشویّنەدا تاوان نەكریّت، جائەگەر بەچونی ئەو ئەوتاوانە نەدەكرا ئەوەپیّویستە لەسەری بچیّت وتاوانەكە مەنع كات، بەلاّم ئەگەر ئەیزانی تاوانەكەی بۆبەرگری ناكریّت ئەوە، بەنەچون بیّزاری خۆی لەوتاوانەدەرئەبریّت بەم كارەیشی ئینشاءالله پاداشتی ئەبیّت.

نان خواردن لەودەعوەتانەدا مادام گومانی لەحەلاّلّ و حەرامی خواردنەكەدا نەبووپیّویستە وچاك وایە رۆژوی سونەتی بۆبشكیّنیّ.

لیّرەشدا دەعوەتی لەرودامان ودەعوەتیّ كەدەوڵەمەندانی بۆبانگ كریّت وگویّ بەفەقیران نەدریّت دەعوەتیّكی ناپەسەندو نارەوایە ومسوڵمانان ئەبیّ نەئەوجۆرە دەعوەتانەبكەن ونەبۆئەوجۆرە دەعوەتانەش بچن، بەتایبەت نابیّ دەعوەتی ستەمكاران وبیّ دینان بكریّت چونكە پیّغەمبەری پایەبەرزو ریّ پیشاندەر( ﷺ)ئەفەرمویّت( لاتُصَاحِب الامُؤمِناً وَلاَ یأكُل طَعَامَكَ الاتَقِیّ) واتەنەكەی رەفیقی بیّجگە لەخاوەن باوەرو نەخوات نانت بیّجگەپەرهیّزكار.

2. میّوانداری نیشانەی مرۆڤ دۆستی وهۆی زیاد بوونی خۆشەویستی ودۆستایەتی یە بۆیە ئیسلام زۆر بەگرنگی دائەنیّ وئەفەرمویّ(مَن كَانَ یُؤمِنُ باالله وَالیَوم الاخِرِ فَلیُكرِم ضَیفَهُ )واتە هەركەسیّ باوەری بەخواو بەرۆژی قیامەت هەبیّت باریّزی میوانەكەی بگریّ.

بۆمیوان ورێزلیٚ گرتنی ئەم شتانەپێویستن:

1. ڕێزلیٚ گرتن وهەڵسان لەبەری لەکاتی هاتنیاو لەکاتی بەڕێکردنیا.

2. خواردنی باش بۆشەووڕۆژێکی وبەمیوان حیسابە تاسیٚ ڕۆژ.

لە پێغەمبەری مەزنەوە هاتوە(کەمیوان بەڕۆزی خۆی دیٚ وبەلابردنی گوناهی خاوەن مالٚ دەچێت میوانیش ئەگەر بەداوای خاوەن مالٚ نەبیٚ وئیشی زۆرزەروری نەبێت چاك نی یەزیاتر لەسیٚ ڕۆژبمێنێتەوە.

مالی هەتیوخواردن قەدەغەیە

ئایینەپرسۆزوبەزەییەکەی ئیسلام سۆزەکەی هەموگۆشەکانی جیهان وهەمووکون وقوژبنێکی دەگرێتەوە، جاچۆن ئەبێت منالە هەتیووبیٚ سەرپەرشتەکان ولاوازو بیٚ دەسەلاتەکان نەگرێتەوە بەلیٚ، ئایینی پیرۆزی ئیسلام ماوەنادات هیچ کەس مالی ئەوهەتیووبیٚ سەرپەرشتانەبەناڕەوابخوات وبەتوندی هێرش ئەکاتە سەریان ئەفەرموێت( إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا )النساء/10 واتە: ئەوانەی مالی هەتیوبەشێوەیەکی ستەم وناڕەوائەخۆن، وەك ئەوەوایە کەئاگری خستبێتە ناوسکیەوە وەلەدواییدا ئەخرێنە ناوئاگری سەختی جەهەنەمەوە، خواردنی مالی هەتیو یەکێکە لەوحەوت تاوانەی کەئەبێتەهۆی لەبەین چون وسزای سەختی جەهەنەم،بەلام ئەوانەی کەبەهەلٚ کەندنی قەبری مردوەکەوەیا بەقازانجی هەتیوەکان ئیشبکەن ئەتوانن بەئەندازەی پێویست لەومالە بخۆن وئەبیٚ بەکریٚ ی ئیشەکەیان، هاتوچۆی هەتیوان وخزمەتکردن ویارمەتی دانیان ئیشێکی زۆرزۆر بەسودەو پاداشتێکی گەورەی هەیە لەڕوانگەی ئیسلامەوە پێغەمبەری مەزن ومرۆڤ پەروەر( ﷺ )ئەفەرمویٚ(أنا وكَافِلُ اليَتِيمِ في الجنَّةِ هَكَذَا وَأَشَارَبالسَّبَّابَةِ وَالوُسطَى وَمَرَّجَ بَينَهُما) واتە: من وبەخێوکەری هەتیو لەبەهەشتا ئاوەهاین ئەنگوستی شەهادەوناوەڕاستی پیشان داولکاندی بەیەکەوە، خوێنەری بەڕێز، ئایا شتێك هەیە لەوخزمەتەکەمرۆڤ بکات بەرەفیقی پێغەمبەری پایە بەرز( ﷺ )گرنگتربیٚ؟

لەکوێت هێنا؟

لەکوێت هێنا؟ یاسایەکە لەیاساکانی ئیسلام وریٚگایەکە بۆبەستنی دەم ودەستی تەماع بازان وچاوچنۆکان لەخواردن وپەیداکردنی مالٚ لەڕێگای قەدەغەوناڕەواوە، بەگوێرەی ئەم یاسایەسالانە دەرامەتی خەلك لێك دەدرێتەوە بەتایبەت پیاوانی میری جائەگەر زیاد بوونی مالەکەی بەشێوەیەکی ڕەواو دروست بوو ئەوەهی خۆیەتی، ئەگینا لیٚ ی وەرئەگیریٚ لەپاشا ئەگەرخاوەنەکەی دیاربوو ئەدرێتەوە بەخاوەنەکەی وەئەگەردیارنەبوو ئەخرێتە سەرمالی گشتی(بيت المال)وبەسودی گشتی کەلکی لیٚ وەردەگیرێت، ئەلێن ئەم یاسایە حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ)ئیشی پیٚ کردووە وەهەرسەربەست وەوالیەکی ناردبیٚ بۆشوێنێك پێشەکی مالەکەی لەگەلدا حیساب دەکردوکاتیٚ کەدەگەڕایەوە دووبارە حسابی لەگەلدەکردوهەموخەرجی ودەرامەتی لەبەرچاودەگرت وهەرچی زیادبوایە لیٚ ی وەردەگرت وئەی فەرموو ئەمەت لەکویٚ هێنا؟ لەوەلامی ئەوانەدا کەئەیان وت خەلك بەخەلات بۆئێمەی هێناوە، ئەیفەرمووئەگەرلەمالی خۆتا بویتایە بۆت دەهات؟

کەواتە لەبەرئەوەی کەتۆسەرپەرشت و والی مسولمانان بوی بۆیە بۆت هاتووە، مالەکە هی مسولمانانە نەهی تایبەتی تۆیە درودوڕەحمەتی خوات لیٚ بیٚ ئەی عومەر، ئەی دلسۆزو دادپەروەر، بەڕاستی چاکت ناسی یاساکەی خوا ئەی هەلکەوتوی باهونەرئەمڕۆکەسانیٚ هەن کەنرخی تۆنازانن وچیٚولەتاریکی دەکوتن، وەك شاعیر ئەلیٚ(شەمشەمەکوێرە قەت خۆرنابینیٚ ئەوچاوی کوێرە خەتای خۆرچی یە؟)

خانوی زیاد ناڕەوایە

ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەوئاینەبەرێزەیە کەلەهەموبارێکی ژیانەوە بەرنامەی هەیەوهیچ گۆشەیەکی لەبیرنەچۆتەوە، هەرشتێك بەسودی خەڵك بێ فەرمانی پێ ئەداوهەرشتێك سوودی نەبێت تاری دەنێ وراوی دەكات وپێ ی دەڵێ(مِن حُسنِ اسلامِ المَرء تُركُهُ مالايَعنيهِ)بەشێكە لەجوانی مسوڵمانیەتی مرۆڤ، وازهێنان لەوشتانەی کەنایەوێت.

خانویەکێکەلەپێویستیە هەرەگرنگەکانی مرۆڤ دەبێ هەیبێت، دیسان ئەویش بێ سنورنیە، دروست کردنی خانوی زیادبۆکۆکردنەوەی سەروەت وسامان لەروانگەی ئیسلامەوە شتێکی رەواوپەسەند نیەپێویستەمسوڵمانان خۆیان لەوخەرجە زیادە بپارێزن و سەروەت وسامان لەرێگای رەواوە بەدەست بهێنن ولەرێگای پەسەندورەواوە خەرجی بکەن، چونکەپێغەمبەری دڵسۆزومرۆڤ پەروەر( ﷺ)لەم بارەوە ئەفەرموێ( ان الرَّجُلَ لَيُؤجَرُفي نَفَقتِها كُلِّهاالا في هَذا التُّرَابِ )واتە ئینسان پاداشتی هەموخەرجی یەکی دەدرێتەوەبێجگەلەوخەرجیەی کەلەخانودا ئەیکات، زەوی ونیعمەتەکانی ناوی هەموی هی خوایەودەبێ هەموخەڵك کەڵکی لێ وەردەگرن نەك خوێنمژانی سەرمایەداربەهۆیسامانە نارەواکانیانەوە هەمووی بخەنەژێردەستی خۆیانەوەوهەزاران کەسیش بێ جێگاورێگابێت،قورئان لەوجۆرەسەرمایەدارانەهەرەشەئەکات وئەفەرموێ(بسم الله الرحمن الرحیم. وَيْلٌ لِكُلِّ هُمَزَةٍ لُمَزَةٍ (1) الَّذِي جَمَعَ مَالا وَعَدَّدَهُ (2) يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ (3) كَلا لَيُنْبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ (4) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ (5) نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ (6) الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الافْئِدَةِ (7) إِنَّهَا عَلَيْهِمْ مُؤْصَدَةٌ (8) فِي عَمَدٍ مُمَدَّدَةٍ (9))سورە الهمزە. واتەسزاولەناوچون بۆئەوکەسانەی کەناوی مەردوم ئەبەن بەخراپەوهەوڵ ئەدەن بۆسوك کردنیان بەدەم یابەسەریابەچاوکەئەمەش خوی ئەوکەسەیە کەهەمیشە خەریکی ماڵ کۆکردنەوەوژماردنیەتی واتە: ئەوانەی کەناوی مەردوم ئەبەن کەسانێکن کەدەوڵەمەندو پارەدارن ولەبەرزۆری سامانی خۆیان کەس بەتایبەت کەم دەستان بەهیچ نازانن وگاڵتە بەم وبەودەکەن وهەرگیز لەمردن ورۆژی دوایی ناترسن، چونکەپارە مردنی لەبیربردونەتەوەوائەزانن داراییەکەیان نایەڵێ بمرن وهەرئەمێننەوەجا، باوانەزانن بەراستی ئەخرێنە ناوئاگرێکی شکێنەرەوە تۆچوزانی ئەوئاگرەچۆنە؟ ئاگرێکی هەڵگیرسێنراوی خوایی یە کەهێرش ئەکاتە سەرجێگای تەماع کەدڵەکانەوئەیانسوتێنێ، بێ گومان ئەوئاگرە دەوریان ئەداو دایان ئەگرێ ورێگای دەرچونیان نابێ ودەش بەسرێنەوە لەناوچەندکۆتێکی قورسی درێژی راکشاودابراوخوشکە مسوڵمانەکان ئاوایە بیروڕای ئیسلام سەبارەت بەسەروەت مەندانی بەناحەق، درێژەی ئەم باسە لەباسی(زەویبۆهەموئینسانە)داهەیەولێرەدا لەوەزیاترباسی ناکەین.

بانقەکان پارێزەرن یاخوێن مژ؟

بانقەکان ئەگەربۆخزمەتی خەڵك دانرێن شتێکی چاك ورەوایەو پێویستە پەرەیان پێ بدرێت وخەڵکی بۆرێنوێنی بکرێت جابۆئەوەی دەرکەوێت کەخزمەتچی خەڵکە ئەبێ ئەم خالانەی تیا بێتەجێ ولێکدانەوەی سەرمایەداران نەکرێت بەمیزانی رەواونارەوایی بانقەکان بەڵکوزۆربەی خەڵك لەبەرچاوگیرێت، خالەکان بریتین لەمانە:-

1. سەروەت مەندانی بەحەق لەبەرخزمەت بەخەڵك وپاراستنی ماڵەکەیان لەنەمان ولەبەین چون پارەکانیان بخەنە بانقەوە.

2. بەرێوەبەران وکاربەدەستانی بانقەکان لەلایەن میریەوەولەسەرماڵی گشتی مەعاشیان پێ بدرێت.

3. بانقەکان بێ منەت قەرزی بێ زیادوکەم بەکەم دەستان وموحتاجان بدەن وفێڵ وفریان لێ نەکەن وبەناوحەق وزەحمەت وشتی واوە پارەیان لێ وەربگرن.

4. بەپارەی بانقەکان مامەڵەی گەورەوبچوکی پێ بکرێت وسودەکەی بۆگشتی بێ ولەشتی گشتی دا وەك قوتابخانەونەخۆشخانەوپردورێگادا خەرج بکرێت وسالانەلەسەدا شتێکی ئەوسوودە کەلەپێشەوەپێی ئەوترێت بەخاوەن پارەکان بدرێت.

بەڵام بەنقەکانی ئەمرۆ بەهێزکەری سەرمایەدارەو خوێن مژی چینی چەوساوەو کرێکارەوتێکدەری خوورەوشتەودروستکەری دووشتە، سەرمایەدارفرەبەشەوکەم دەست وچەوساوەوزەحمەت کێش وبێ بەشە، ئەوەیەیاسای دەستکردی بەشەر، بێجگەلەشەربەدی ناکەیت یەك تاقە خەیر، هەرجۆرە زیادی وکەمیەك لەوەرگرتن ودانەوەی ئەوپارەدا قەدەغەونارەوایەوبەرسو(الربا)ئەکەوێت، مەگەرخەزێنەی گشتی پێویستی بەپارە هەبێت ئەویش ئەبێ لەپارەی سەروەت مەندان وەرگیرێت نەك لەوانەی کەم دەستن وموحتاجی پارەن، کابرای دەولەمەندئەگەرسەیارەیەکی هەبێت وبیباتەگەراج حەتمەن کرێ ی لێ ئەسێنرێت وهیچ شتێکیش نالێت چونکە ئەلێ پارێزگاریان کردوە، بەلام ئەگەر چاوچنۆك وتەماع بازورەزیل نیەو مەبەستی تەنیا کۆکردنەوەی پارە نیە بۆئەبێ بۆپارێزگاری ئەوپارەیە ئامادەی ئەویارمەتیە نەبێت وئەوپاداشەگەورەی خواکەیەك بەدەیە بەگرنگ نەگرێت؟!! ئەگەربانقەکان بەشێوەی ئیسلام ئیش بکەن کەم دەست وفەقیرکوا خەیالی گزی ودزی ئەکەن؟ ئەگەرزەحمەتکێش وکرێکار رزگاری خۆیان دەوێ، بۆدوای یاساورێچکەدەستکردەکان دەکەون وئیسلامیان ناوێ؟!!.

خۆتەنهائیسلامەداکۆکی لەسەرماف ئەوان ئەکات ورێزیان بۆدائەنێت.

بزانە چۆنی خەرج ئەکەیت

ئیسلام هەرچۆنێك لەبارەی پارەدەرهێنانەوە یاسای لەکوێت هێنا؟ ی هەیەیاسای(بزانەچۆنی خەرج ئەکەیتی)هەیەو ئەفەرمویێت(كُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ )[7] بخۆن وبخۆنەوە لەشتەپاکەکان وهەڵەخەرج نەبن بەڕاستی خواهەڵەخەرجانی خۆش ناوێت. وئەفەرمویٚ(وَلا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًاإِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ )[8] ماڵ بەخۆرایی وبەهەردم خەرج نەکەن، ئەوانەی کەوا دەکەن برایانی شەیتانەکانن. هەروەهاپێغەمبەری مەزن( ﷺ)ئەفەرمویٚ خواسیٚ شتی ئێوەی پیٚ ناخۆشەیەکێك لەوسیٚ شتانەلەناوبردنی ماڵەوکوئەفەرمویٚ( واضَاعَه المال )فەوتاندن وزایەکردنی ماڵە. لەیاسای ئیسلامدا چونکە هەمووخەڵك بەبەندەی خوائەزانیٚ وهەمووماڵیش بەماڵی خوالەبەرئەوەماوەنادرێت بەخاوەن ماڵێك بەکەیفی خۆی ماڵی خۆی لەبەین ببات وبەهەڵەخەرجی وبیٚ کەڵك زایەی کات، بەڵکوماڵەکەی لیٚ ئەسەنرێت لەلای حاکم یاپیاوماقوڵی شوێنەکەدائەنرێت وبەگوێرەی پێویست خەرجی ڕۆژانەی پیٚ ئەدرێت. لێرەدووشت وەردەگرین یەکەم/ دڵسۆزی ئیسلام سەبارەت بەخەڵك وسەرپەرشتی کردنیان لەخۆیان چاکتر، دوهەم/ هاوبەشی خەڵك لەسەروەت وسامان دا.

ئاڵتون وزیوعەنبارنەکەیت

ئەوئیسلامەی کەهەمیشە سورە لەسەرهێنانی خێروبەرەکەت بۆکۆمەڵ ناگونجیٚ سەبارەت بەوانەی ئاڵتون وزیو(پارەی ڕەواجی کات)لەناوبازاڕودەستی خەڵکا هەڵگرن وزیادلەپێویستی خۆیان ئەنباری بکەن وبراوخوشکەکانیان موحتاج وئیحتیاج بن بیٚ دەنگ بیٚ، چونکە ئەم ئیشە پیشان دەری دووشتە، یەکەم/ نیشانەی بیٚ ڕەحمی وبیٚ سۆزی ودڵ ڕەقی سەروەت مەندە کەئەمەش ڕەوشتێکی ناڕەواوناپەسەندەو پێغەمبەری مەزن( ﷺ)ئەفەرمویٚ( مَن لايَرحَم لايُرحَم)واتەئەوکەسەی ڕەحم نەکات ڕەحمی پیٚ ناکرێت هەروەها خوای گەورە هەڕەشەلەوکەسانە ئەکات وبەڵێنی سزای سەخت بەکۆکەرەوەیانی ئاڵتون وزیوئەنبارکەرانی ئەداوئەفەرمویٚ( وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ (34) يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لأنْفُسِكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنْتُمْ تَكْنِزُونَ) 34-35، واتەئەوانەی کەئاڵتون وزیو عەنبارئەکەن ونایدەن لەڕێگای خوادا، ئەی موحەمەد( ﷺ)مژدەیان پیٚ بدە بەسزایەکی زۆر ئێش وئازاردار ئەوڕۆژەی کەئەنبار کراوەکە لەناوئاگری جەهەنەمداسورئەکرێتەوە ولەناوچاوانیان وتەنیشتیان وپشتیانی پیٚ داخ ئەکرێت وپێیان ئەوترێت بخۆن، ئەوەئەوزێڕوزیوەیە کەلەدنیادا کۆتان دەکردەوە بۆخۆتان، ئەم ئایەتە پیرۆزە بەچاکی وبیٚ پەردە ئەوعەنبارکردنەی

---

[7] – سورەتی الاعراف ئایەتی 31/

[8] –الاسراو/26-27

بەتاوانێکی گەورە پیشان داو پێویستە مسوڵمانان بەچاکی ئەوڕاستیە بزانن ولەوکردارە ناپەسەندە خۆیان دووربگرن، وتراوە ئەوماڵەی زەکاتی لێ بدرێ کەنزنیە هەڵگرتنی بەڵام ئەم قسەیە لاوازە بەچەندبەڵگە:

یەکەم/ ئایەتەکە ئەوەناگەیەنێ.

دوهەم/ ئەوفەرمودە کەهاتوەلەوماناڵدا ناکۆکی تیاهەیە لەڕستەکەیدا فەرمودەی(فی المالِ حقٌّ سِوی الزَّكاه) لەماڵدا بێجگەلەزەکات هەیەئەویش لەبەرانبەریەوەهەیە.

سێهەم/ ئەوعەنبارقەدەغەکردنە لەروحە ئینسان دۆستەکەی ئیسلامەوەنزیکەوگونجاوترە لەگەڵ یاساکانی تری ئابووریدا خوایش زانایە.

چوارەم/ ئەوعەنبارقەدەغەکردنە گونجاوترە لەگەڵ ئایەتی(وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ)البقره/219 واتە پرسیارت لێ دەکەن چی ببەخشن؟ بڵێ: ئەوەی کەلەخۆتان زیادە.

پێنجەم/ پێغەمبەری مەزن(ﷺ)ئەفەرموێ(لَيسَ لابنِ ادَمَ حَقٌ في سِوى هذهِ الخِصال بَيتٌ يُسكِنُهُ وَثَوبُ يُواري عَورَاتهُ وَجَلفُ الُبرَّ وَالمَاء)واتە بەنی ئادەم ڕەوانیە بۆی هیچ شتێك تایبەتی کا بەخۆیەوە وخەڵکی لێ بێ بەشبکات بێجگەلەم سێ شتانە، یەکەم/ ماڵێك کەتیادانیشێت وپێویستی یە زەروریەکانی ئەودانیشتنە.

دوهەم/ پۆشاکێك کەعەیبی خۆی پێ داپۆشێت وهاوسەریش بەشێك لەوپۆشاکە( هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ)البقره/187 ژنان بەرگی ئێوەن وئێوەش بەرگی ژنانن.

سێهەم/ نانی روت وئاوبەشی پێ بژێوی خۆی ترمزی ئەڵێ جوان وڕەوانە(حدیپ حسن صحیح).

بەڵگەی شەشەم/ پێغەمبەری مەزن(ﷺ)ئەفەرموێ(يَا ابنَ ادَمَ انَّكَ ان تَبذُلِ الفضلَ خير لَكَ وَلاتُلامُ علي كَفافٍ وابدَء بِمَن تَعُولُ وَاليَدُ العُليَا خيرُ مِنَ اليَدِ السُّفلي). ترمزی ئەڵێ فەرمودەیەکی جوان وڕەوانە(حسن صحیح).

واتە، ئەی کوڕی ئادەم، ئەگەرزیادەکەی خۆت ببەخشیت زۆرچاکەبۆت وەئەگەرنەیبەخشیت زۆر خراپەبۆت بەڵام سەرزەنش ناکریەیت لەسەرئەوەی کەپێویستت بێت، وەئەم پێویستیە تاساڵێك ئەبێ واتە، ئەوەی بۆساڵێك پێویستی بێ مادام خەڵك زۆرلەبرسێتی دا نەبێت لۆمەی ناکرێت وەلەم بەخشینەدا لەنزیکترین کەسی موحتاجی خۆتەوە دەست پێ بکە بەخشندە چاکترە لەگیرندە لەبارەی پاداشەوە، مەبەستی ئیسلام لەم ڕستەدابێ منەت نەکردنی بەخشندەو داخستنی دەرگای تەمەڵییە کەدوومەبەستی گرنگن بۆچاك کردنی باری ئابووری لەژیانی مرۆڤدا چونکە ئەگەروەکو کۆمۆنیستەکان ئەگەر هەرئیشی بەلاوەپەسەند بێ وپاداشی زیادەی نەبێ، کابرا تائەوجێگایە کەبۆی بکرێت هەوڵی خۆلادان لەئیش وکەم کاری ئەدات وئەڵێ، خۆزیادەکەی بەمن ناگات ئیتر بۆخۆم زەحمەت بدەم، وەئەمەش ئەبێتە هۆی

چەندین دەردی بێ تیماری ناوکۆمەڵ کەسوکەکەیان تەمەڵی وکەم دەرامەییە نموونەی ڕونی ئەم سەردەمە خاکە پان وبەرین وبەپیتەکەی ڕوسەو کەم دەرامەتیەکەی کەبۆڕزگاربون لەبرسیا ولاتەرۆژئاواییەکان سەدان ئیشی پێچەوانەی بیروڕای خۆیان پێ ئەنجام داوە بەلاَم ئیشکەر لەڕوانگەی ئیسلامەوە زۆربەرێزەوپاداشتی ئیشەکەی وچاکەکەی پێ ئەدرێ وسوپاسی ئەکرێت( إِنْ تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ) التغابن/ 17، واتە: ئەگەرچاکەبکەن بەماڵێکی پاك ودڵێکی پاك وخاوێنەوەخواپاداشتەکەتان چەندبەرانبەر دەکاولێتان خش ئەبێ وخواڕێزتان ئەگرێ وبەحەوسەڵەیە(مَن جاوبالحَسَنَه فَلَهُ عَشرُاَمثِالِها)واتە: هەرکەسێك چاکەیەك بکات بەدەبەرانبەرپاداش ئەدرێتەوە(اليَدُ العُليَا خَيرُ مِن يَدَ السُّفلى)بەڵێ بە ڕاستی موڵکیەتی تاکوپاداشی چاکەکانی گرنگترین هۆی پێشکەوتنی ئابووریەومایەی دڵ گەرمی خەڵکە بەئیشەکانی بەلاَم نەموڵکیەتی بێ سنوری بەلاوەڕاستە وەکوبەرنامەی سەرمایەداری نەهاوبەشی بێ سنوری بەلاوەچاکە وەکوکومۆنیستی بەڵکوخۆی ڕێبازێکەسەربەخۆولەهیچ لایەك سوودی وەرنەگرتووەبەڵکوئەوان بەبۆنەی ئیسلامەوەناچاربەزیادوکەمی بەرنامەی خۆیان بوون ( وَكَذَلِكَ جَعَلنَاكُم اُمَّةً وَسَطًا )واتە، وەئاوەهائێوەمان کردووەبەخاوەنی بیروباوەڕێکی مام ناوەندلەهەمووبارێکەوە.

خوێنەری بەڕێزکۆکرنەوەی سەروەت وسامان وعەنبارکردنی گوێ نەدانە بەخەڵکی کەم دەست وئیحتیاج وەك لەپێشەوە وتمان:

یەکەم/ نیشانەی بێ ڕەحمییە، دوهەم/ ئەبێتەهۆی پەیدابونی ڕق وقینوحەسادەتی چینی زەحمەتکێش وموحتاج وکەم دەست سەبارەت بەدەوڵەمەندان بۆیەئیسلام ئەوەندە بەم کۆکردنەوەوعەنبارکردنەدژەو هێرشی توندی کردووەتە سەری.

خوێنەری بەڕێز، دواکەوتنی مسوڵمانان لەم سەردەمەدا هۆی نەناسینی ئاینەکەیانەو، زۆربەی مسوڵمانی ئەم سەردەمەسەربازو شوێنکەوتوی یاسادەستکردەکانن وپێیان وایەبەوشێوەیەبەئەنجام دەگەن وخۆشبەخت ئەبن لەگەڵ ئەوەدائەبینن نەسەرمایەداری بێ سنوور خەڵکی حەساندوەتەوەونەکۆمۆنیستی هەپرون هەپرون بو، ئیسلام یاسایە بۆهەمووبەشەرو وەبەبێ ئەویاسایەناگەن بەخێرودوورنابن لەشەڕ، ئەوەی لام ڕوونەبوێت بەیان دەکەم، پێت خۆش بێت یان نەئیسلامەڕێگەم چونکە بێ فەرقەبۆهەمووبەشەر، هێنەری خێرەو لابەری زەرەر تائەویاسابوومرۆڤ حەساوە، بەنەمانی ئەوژیانیش نەماوە.

زەکات

زەکات یەکێکە لەوفەرزە دیاریانەی کەپێویستی سەرشانی مسوڵمانانە، زەکات خاوێن کەرەوەی دڵ ودەرونە لەماڵ پەرستی ورژدی وهۆی بڵاوبونەوەی خۆشەویستیەلەناوخەڵکدا، زەکات ئەبێتە هۆی ئەوە کەکەم دەستان ماڵی دەوڵەمەندان بەهی خۆیان بزانن وپارێزگاری لیٚ بکەن وحەزبەزەرەروزیانیان نەکەن ووهەمیشە بەچاوێکی ڕێزەوە سەیریان کەن، زەکات فەرزە لەسەرهەموومسوڵمانە دەسەڵات دارەکان بۆئەوتاقمە مسوڵمانەی کەخواخۆی باسی کردون، زەکات لەهەمووخۆراکیەك کەئینسان پێی بژی ومەڕوبزن و وشتروڕەشەوڵاخ وئاڵتون وزیوداواجبەوکات وچەنی وچونی زەکات لەهەمووپەڕاوەفیقهیەکاندا باسکراون ولەم نامیلکە بچوکەدا ناگونجیٚ باسکردنی، زەکات بۆدابین کردنی ژیانی سەروەت مەندوکەم دەست ئیشێکی زۆرپێویست وگرنگە ونابیٚ چاوپۆشی لیٚ بکرێت چون خوای گەورە زەکات نەدەرانی بەموشریك ناوبردوەوئەفەرمویٚ( وَوَيْلٌ لِلْمُشْرِكِينَ الَّذِينَ لا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ )فصلت/6-7واتە: وای سزای سەخت بۆئەوموشریکانەی کەزەکات نادەن، جاکەوابومسوڵمانان لەزەکات داناناییٚ کەمتەرخەم بن یالەزەکات دانافێڵ وفڕبکەن خوازۆربەئاگایەو فێڵ وفڕی لیٚ ون نابێت، خوای گەورەودانا ڕازی نەبوە هیچ کەس لەبارەی زەکات بەرانەوە قسەبکات خۆی باسی فەرموون وکردونی بەهەشت بەشەوە، هەرکەسێك یەکێك بولەوهەشت تاقمە حەقیەتی زەکات وەرگرتن، ئەگینانەزەکات دەر زەکاتەکەی لەکۆڵ دەکەوێت ونەکابرای زەکات وەرگر ئەوزەکاتەی بۆدروستە بەڵکوئەوزەکات وەرگرتنە شتێکی حەرامەوماڵ خواردنە بەڕێگای ناڕەوا(وَلا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ)البقرە/188 واتە: ماڵی یەکتر بەبیٚ هۆیەکی شەرعی نەخۆن.

زەکات بەکیٚ ئەدرێت؟

زەکات کەئەرکێکی گەورەوبەنرخەومایەی زیادبون وفراوان بونی فەڕوبەرەکەتەوهۆی خۆشەویستی وپاك بونەوەی کۆمەڵە لەنەخۆشی ڕژدی وحەسادەت وئەدرێت بەهەشت تاقم.

1. فەقیر: ئەوەیە کەهیچی نەبێت.

2. مسکین: ئەوەیە کەهەیبێت بەڵام بەشی نەکات.

تیٚ بینی/ هەندیٚ لەزانایان بەپێچەوانەوە مانای فەقیرومسکین یان کردوە بەهەرحاڵ هەرکام ڕاست بیٚ هەردووەگرێتەوە بەکورتی زەکات بەوەی کەهیچی نەبیٚ یابیبیٚ وبەشی نەکات ئەدرێت، وەهەردووژیانیان دابین ئەکرێت.

3. زەکات کۆکەرەوە، واتەئەوانەی کەئەکرێنەمەئموورولیٚ پرسراوی زەکات کۆکردنەوە بەشێك لەزەکاتیان پیٚ ئەدرێت بابەشی خۆیشیان هەبێت بەومەرجەی لەسەرئەوئیشەیان معاش وەرنەگرن، ئەوەم پیٚ خۆشە کەمعاشیان نەبێت، چونکەئەوەئەبێتە هۆی چەند سودێك وەك دڵسۆزی زەکات کۆکەرەوە چونکە بەشی خۆی تێدایە، هەروەها زەکات کۆکەرەوە لەنیەتی خراپ ڕزگارئەکرێت ئەمەش یارمەتی دانی ئینسانە لەسەرچاکە( وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى ) المائده/2

4. نۆمسوڵمان زەکاتی پیٚ ئەدرێت بۆئەوەی زیاتر دڵ خۆش ببیٚ بەدینەکەی ودڵنیا بیٚ کەمسوڵمان لەپێشینەی خراپی چاوپۆشیان کردووە وهیچ نیەتێکی خراپیان سەبارەت بەونیە، دەتوانرێت لەوبەشە دانرێت ئەوبیٚ باوەڕانەی کەبەتەماع لەدژایەتی مسوڵمان بەرگری بکریٚ وچاوەڕوانی باوەڕهێنانی بکرێت هەرخوازانایە.

5. بۆئازادکردنی بەندە، بەندەئەوکەسانەبوون کەلەپێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دا وەکو حەیوان دەفرۆشران وزۆربەیان دیلەکانی شەڕبون، پەڵەیەك بوولەپەڵەڕەشەکانی سەردەمی نەفامی ویەکێك بوو لەهەزاران کۆسپی ڕێگای ئیسلامەتی هەربۆیە ئیسلام ئەم ئیشە ناپەسەندەی بەشێوەیەکی دانایانەولەسەرخۆ وەك باقی خوەناپەسەندەکانی سەردەمی نەفامی چارەسەرکردووچەندرێگای دانابووبۆلەناوبردنی وەك، بەڵێنی پاداشی گەورەبۆئازادکەران وئازادکردنی بەندەی بۆزۆربەی تاوانەکان داناو بەوەشەوەنەوەستابەشێکی دیاری لەزەکات تەرخان کردبۆئازادکردنی بەندەکا بەڵام یەکسەر قەدەغەی نەکرد لەبەرچەند هۆیەك، یەکەم: ژمارەیەکی زۆرعادەتیان بەبەندایەتی یەوە گرتبوو کەهەندێکیان لەپاش ئازادی نەیان ئەتوانی بژین ئەبوون بەبارێکی قورس لەسەرگەل.

دوهەم: سەرمایەیەکی زۆربوون بەدەست سەروەت مەندانەوە ئەگەربەزۆرداوای ئازادکردنیان بکرایەدژایەتی توندی ئەکراو زیانی لەسودی زیاتردەبوو چونکە مرۆڤ زۆرماڵی خۆش ئەویٚ وئامادەنیە بەئاسانی دەستی لیٚ هەڵگرێت، بۆزیاترشارەزابوون لەم قسەیەبچۆتەماشای باسی(لەبەرڕژدی زۆرنیە)بکە.

سێیەم: تارێگە دەستی مسوڵمانان نەگیرێت لەموقابەلە بەمیسل دا(المقابلە بالمپل)چونکە باوی ئەوسەردەمە وابووزۆرێك لەدیلەکانی شەڕئەکران بەبەندە، واتە: ئەگەرکافرەکان مسوڵمانەکانیان بگرتایەدەیان توانی بەگوێرەی یاسای سەردەمی نەفامی بیان کەن بەبەندەی خۆیان ووەکوحەیوان کڕین وفرۆشتنیان پیٚ بکەن، جاتائەورێگایەش وەك ڕێگایەکی سیاسی لەدەستی مسوڵماناندا بمێنێتەوە سوپاس بۆخوالەم سەردەمەدا ئەم شێوە بەندایەتیە نەماوە ئەگەرچی سەدان ڕێگای بەندایەتی تازە پەیدابوە وەك بەندایەتی گرۆهی وحزبی فیرقەیی ومەزهەبی هتد.

ئەتوانرێت، ئەوبەشەی زەکات ئەمرۆ بۆئازادکردنی مسوڵمانەکان لەژێر دەستی ستەمکاران وبێ باوەڕاندا بەکاربهێنرێت، هەر خوازانایە.

6. قەرزار، واتەبەشێك لەزەکات ئەدرێ بەوانەی کەقەرزارن وناتوانن قەرزەکانیان بدەنەوە بەمەرجێك لەسەرشتی حەرام قەرزار نەبوبێ یابەچاکی لەوحەرامە توبەی کردبێ(واتە ئیسلام مادام داوای قەرزدان ئەکات ئامادەیە لەکاتی نەبونی دەسەلاَتی قەرزارەکەدا تائەوجێگایە کەبۆی بلوێت وبۆهەمیشەیش بەشێکی تایبەتی زەکاتی بۆداناوەوئەوقەرزەئەبژێرێتەوە).

7. موجاهید، واتە، بەشێکی تری زەکات بۆئەوکەسانەیەکەخەریکی هەوڵ وکۆشش وغەزان لەڕێگای خواداوخەریکی پارێزگاری ئاینن چونکە ئەوانە ناتوانن کاروکۆششی تربکەن بۆدابین کردنی ژیانی خۆیان و خێزانیان پێویستە ژیانیان دابین بکرێت تابەخەیاڵی ڕەحەتەوە درێژە بەئیشە پیرۆزەکەی خۆیان بدەن، سەروەت وسامانی موجاهید دەوڵەمەندی ناکات چونکە موجاهید هەمیشەگیانی لەخەتەردایە چ جای ماڵ وسامان. لەم حاڵەتەدا واتەئەگەر هەیبوداوانەکات چاکترە بەلاَم ئەگەرپێ ی درا وەری گرێت بادەوڵەمەندیش بێ.

8. ڕێبوار، واتە، تاقمێ ترلەزەکات بەران ئەوڕێبوارانەن کەلەڕێگاداخەرجیان پێ نەمابێت ودەستیان بەماڵی خۆیان ناگات، بالەماڵیشا دەوڵەمەند بن جائەگەر بەقەرزبیبەن ولەپاشا بیهێننەوە چاکترە چونکە هەیەتی وئیسلامیش لەگەڵ کۆکردنەوەی ماڵدانیەو هێنانەوەی ڕەواترە, ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە کەئیسلام ماوە نادات کەس بکەوێتە تەنگیوە مادام ڕێگای هەبێت جاکابرای ڕێبواریش لەویاسایە گورێ ناکرێت ولەوتەنگانە ڕزگارئەکرێت هەروەکولەیاسای(تاماڵ لەدەستی دەوڵەمەندداکۆنەبێتەوە)دەرناچێت واتە، لەبەریاسای یەکەم پێی ئەدرێ وەلەبەریاسای دووەم بەقەرزبێت چاکترە، بەکورتی ئەوانەی کەزەکاتیان پێ ئەدرێت بریتین لەوهەشت کەسەی کەخوای گەورەلەم ئایەتەپیرۆزەدا باسیان ئەکات وئەفەرموێ :( إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ)التوبه: 60.

واتە((زەکات بۆفەقیرو مسکین وکۆکەرەوەی زەکات ونۆمسوڵمان وئازادکردنی بەندەکان وقەرزاران وموجاهیدان وڕێبوارانە، ئەمەبڕیارێکی بێ ئەم لاولای خوایە، وەخوازاناودانایە.

بۆئاگاداری

زەکات ئەگەربەشێوەیەکی ئیسلامیانە بدرێت نەزەکات دەرتوشی هەڵە ئەبێ ونەزەکات وەرگر هەستی کەمی دەکات خوای گەورە داوالەزەکات دەران ئەکات کەوریابن وزەکاتەکەی خۆیان بەمنەت نان وئازاردانی زەکات پێدراو

هەڵنەوەشێننەوەوئەفەرموێ(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالأَذَى )البقره/ 264، واتە: ئەی خاوەن باوەڕان چاکەکانی خۆتان بەمنەت نان وئازاردان هەڵنەوەشێننەوە. هەروەها ئیسلام پێی خۆش نیە کەزەکات دەرخۆی ڕاستەوخۆئەوزەکاتە بدات بەفەقیروموحتاجەکان بەڵکوکۆکەرەوەی زەکاتی داناوە، تازەکاتەکان کۆکاتەوەو دابەشیان بکات بەسەر زەکات بەراندا ولەم ئیشەیش زەکات کۆکەرەوە بەشی خۆی هەیەوهیچ کامیان ناتوانن منەت بخەنە سەرئەویتریان هەروەها پێغەمبەری دڵسۆزوپایەبەرز(ﷺ)زیاترئەم باسە بۆسەروەتمەندان ڕۆشن ئەکاتەوە وئەفەرموێت(هَلْ تُنصَرُونْ وَتُرزَقُونْ الاٍبِضُعَفَائِكُم)ئەی دەوڵەمەندەکان لەخۆتان بایی نەبن وکەم دەستان وبێ هێزان بەکەم تەماشامەکەن ئایائێوە وادەزانن ئەگەر بێ هێزان وکەم دەستان نەبن خوائاوا بەلێشاوی ڕۆزیتان پێ ئەدات سەرتان ئەخات؟ واتەئەگەربەچاکی سەرچاوەی هێزوڕۆزی خۆتان بزانن وبزانن بەبۆنەی چ کەسانێکەوە پێتان ئەگات ئێوە سوپاسی بێ هێزان وکەم دەستان دەکەن، چونکە خوابەبۆنەی ئەوانەوە سەرتان ئەخات وڕۆزیتان پێ ئەدات. خوێنەری بەڕێز، ئەگەرزەکات بەوشێوەیەکۆبکرێتەوەوجادایەش بکرێت ئیترکام شەرم ئەمێنێ بۆفەقیرو موحتاجان وباقی زەکات بەرانی تر؟ لەگەڵ معاشدا چی کەمە؟

2. چونکە لەم باسەداچەندجار ناوی معاشمان بردپێویستە ئەم ڕاستیەش بڵێین مەبەستی ئێمە معاشێکە لەحکومەتی ئیسلامدا بدرێت ئەگینا معاشی حکومەتانی ئەمڕۆ نەبوونی زۆرچاکترو بێ زیان ترە تابونی لەبەردەیان هۆبەرچاوتریان أ. لەباتی ئەنجامدانی یاسا دەستکردەکانە.

ب. سامانی وڵاتان بەشێوەی دادپەروەرانە دابەش نەکراوە ولەپارەی دەوڵەتاندا بەشی زۆرکەسی تێدایە.

ج. زۆربەی دەرامەتەکان لەڕێگای بێ شەرعیەوە وەك سو وباج وبەرتیل...هتد پەیدائەبن.

د. ناڵێین حەرامە چونکەبەشێکی حەڵاڵیشی تێدایەوەکوپارەی نەوت وباقی سەرچاوەکانی تری وڵات.

3. وشەی(فی سبیل الله)چونکە لەزۆربەی ئایەتەکانی قورئان وفەرموودەبەنرخەکانی پێغەمبەری مەزن دا(ﷺ)بەمانای غەزا هاتوە بۆیە ئێمەیش وامان لێکدایەوە، ئەگینا(فی سبیل الله)واتەلەڕێگای خودا هەرشتێك خێروخۆشی گشتی تیابێت وتایبەت نەبێ بەکەسێکەوە خوای گەورە ئەوشتە بۆخۆی وبەناوڕێگای خۆی ناوئەبات تاخەڵك چاکتر ئەوئیشە بکەن وەکو دروست کردنی مزگەوت وپرد وجادەوشتی وائەوەندەی هەیە خەبات وتێکۆشان لەڕێگای خوادا گەورەترین وبەنرخ ترین شتە بۆخەڵك بۆیە هەمیشە بەو وشەیەناوئەبرێت وهەرکەوترا زەینی ئینسان بۆئەودەچێت چونکەئەگەرجیهاد نەبێت بۆپارێزگاری ئاینی خوا ستەمکاری وداگیرکردن وئازاردان وبەدڕەوشتی هەمووکەسێك وهەمووکون وقوژبنێکی ئەم جیهانە ئەگرێتەوە وەك ئەمڕۆکەئەبیستین وئەبینین.

4. پاراستنی ئابڕوگیانی ئینسان شتێکی زۆرگەورەوپێویستە، ئاشکرایە تائینسانێکی کەم دەست وموحتاج هەبێت خەرجکردنی پارە لەجوان کردنی مزگەوتاندا شتێکی ناڕەوایە بەڵام دروستکردنی جیاوازترەوبەرژەوەندی گشتی لەبەرچاوئەگرێت، ئەوەی پێویستە بزانین ئەوەیە کەدروستکردنی هەزاران مزگەوت ناگات بەڕزگارکردنی ئینسانێك لەمەرگ وشەرمەندەی ئەوەش بزانن کەکەوتنەناو تەنگوچەڵەمەوە گەورەترە لەمەرگ وەزۆرئینسانیش دوچاری ئەوبەڵایە ئەبێ بەهۆی کەم دەستی ونەداریەوە،جابرای دەوڵەمەند کێ تاوانبارە؟ ئەوماڵە هی خۆتە یاهی خوایە؟ ئەگەربەهی خوای ئەزانێ ئەوانیش بەشدارن چونکە بەندەی خوان وخوا خۆی پێویستی کردووە لەسەر تۆبەشیان بدەی.

ئیسلام ئاشتی خوازە

ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەمیشە هەوڵ ئەدات کەناکۆکی لەناوگەلدا لاباوخۆشبەختی بۆهەموان دابین بکات، دیارە لایەنێك لەلایەنەکانی ژیانی مرۆڤ کەئیسلام بەخەمە بۆی وسەرپەرشتی دەکات تاناکۆکی وشەڕو هەرا ڕونەدات مەسئەلەی کڕین وفرۆشتنە. هەرکڕین وفرۆشتنێك کەببێتە هۆی ناکۆکی لەنێوان خەڵکدائیسلام پێی رازی نیەئەوانەی کەزیانیان زۆربێ، بەهیچ شێوەیەك ماوە بەکڕین وفرۆشتنیان نەدراوە وەکو فرۆشتنی تۆوی حەیوانێکی نێر(عسب الفحل)وئەوبەچکەی ناوسکی حەیوانێك ویاکڕین تاپەیدابونی وفرۆشتن یاکڕین وەختێك دەستت لێداوەیافڕێ درا یاتابەردێك فڕەدرا ودومامەڵەیەك مامەڵەداو دەیان شێوەی تر کەبەدرێژی لەپەڕاوە گەورەکاندا باسکراوون چونکە ئەبنە هۆی ناکۆکی وقڕوقاڵە لەناو خەڵکاو بەهیچ شێوەیەك ئەم کڕین وفرۆشتنە ڕەوانیەهەروەهاکەرەسەکانی لۆتی وشتە منالێ خەڵەتێنەکانیش بەرئەم بەشە ناڕەوایە دەکەون وکڕین و فرۆشتنەکە دانامەزرێت وخۆی لەخۆیەوە هەڵدەوەشێتەوەوپێویستە مسوڵمانان لەوجۆرە کڕین وفرۆشتنانە دوورکەونەوە. بەداخەوەئەمرۆبازاڕودوکانەکانمان پڕەلەوشتەقەدەغەکراوانەوکابراخۆی بەمسوڵمان ئەزانێت کەچی بەوشتەحەرامانەنانی ماڵ ومناڵی پەیدائەکات، بەخوالەڕۆژی قیامەتداهەرئەومناڵانەت دژت ئەوەستن.

هەروەها کڕین وفرۆشتنێك کەزیانی خەڵکی یاکەسێکی تیابێت بەچاك نازانێ ومسوڵمان هەڵئەنێ لەسەروازهێنان لێی وەکو ئەوەی کابرایەکی لادێی شتێکی پێویستی خەڵکی شاربهێنێ وکابرای شاری بڵێ لای من داینێ تابەنرخێکی گرانتر بۆت بفرۆشم(سمسار)ئەم شێوە مامەڵەیە چونکە زیانی زۆرە تاقازانج ئیسلام بەرگری ئەکات وەئەگەر کرا مامەڵەکە دائەمەزرێت وکابرای شاری تاوانبارە هەرلەوجۆرە مامەڵەیە دەرچون لەشار بۆکڕینی ئەوشتانە کەلەدەرەوەی شارەوەدێن تابەنرخێکی کەمتر بیان کڕێت وکابرای کەل وپەل هاوەربخەڵەتێت،

جائەگەرگەیشتەشاروزانی خەڵتاوەبۆی هەیەدەست بەجێ ئەومامەڵەیە هەڵوەشێنێتەوەبەڵام ئەگەردەنگی نەکرد

مامەڵەکەدائەمەزرێت وکابرای کڕیارتاوانبارەچونکەئیشەکەی پێچەوانەی بڕیاری ئیسلام بووەهەروەها لەم

بەشەیەمامەڵە لەسەرمامەڵەوزیادکردنی قیمەتی شت ومەبەستی کڕینی نەبێت هەروەها ناڕەوایە خورماوترێ فرۆشتن

بەکەسێك کەبزانرێت بۆشەرابیەتی.

کڕین وفرۆشتنی جگەرەناڕەوایە

لەپێشەوە بۆمان دەرکەوت هەرشتێك زیانی هەبێت ئیسلام بەشتێکی ناڕەوای داناوەوتازیانی زیاتر هەبێت

بێزراوترونارەواترە، جگەرەتەنهابۆکێشانەوکێشانیشی بێجگەلەزیان شتێکی تری تیانیەبەراوردی لەگەڵ هەرکام

لەیاساکانی شت قەدەغەکردانا بکەیت ئەبینی کەجگەرە سەرقافڵەیانە، کەوابێ پێویستە لەسەرمسوڵمانان نەك

تەنهالەکێشانی بەڵکو لەکڕین وفرۆشتن وکردنی خۆبپارێزن، کابرا ئەگەرخۆیشی نەیخوات بەکڕین وفرۆشتن

وکردنەکەی ئەبێت بەشەریکی تاوان ویارمەتی دانە لەسەر تاوان وخوای گەورەش ئەفەرموێت( وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى

وَلا تَعَاوَنُوا عَلَى الاثْمِ وَالْعُدْوَانِ )المائده/ 2 واتەیارمەتی یەکتربدەن لەسەرچاکەوبەرهێزکاری وەیارمەتی یەکترنەدەن

لەسەرتاوان ودوژمنایەتی.

بەڵام بەداخەوە ئەوەندەباوەڕەکەمان بێ کەڵك ولاوازەلەگەڵ ئەوەدا کەجگەرە بەشتێکی پیس ئەزانین وهەمووشتێکی

پیسیش لەڕوانگەی ئیسلامەوە حەرامە کەچی بۆکۆکردنەوەی ماڵ یازیادکرنی ئابڕوئەیچێنین وئەیفرۆشین وئەیکڕین

ولەماڵدا بەفەرموو فەرمووبەخەڵکی دەبەخشین...کاکی مسوڵمان کەمێ سەرهەڵبڕەوشەرم لەخوابکە بەتاوان

ئابڕوپەیدانابێ، ئەگەرلەم دنیاش نەبێت تاوان مرۆڤ بێ ئابڕودەکات، کۆکردنەوەی سامانیش سنووری هەیە،

پێویستە ڕێگای پەیداکردنی حەڵاڵ بێت وزۆریش لەسەریەك کۆنەکرێتەوە(تەماشای باسی-ئاڵتون

وزیوئەنبارنەکەیت)بکە.هەروەها تەماشای فەرمودەی(مِن اینْ اکْتسبتهُ ومْن اینْ انفْقتْه)بکە.

خوێنەری بەڕێز، بۆزیاتر شارەزابوون لەبارەی جگەرەوە بچۆنامیلکەی(جگەرەدژی ئازادیە)بخوێنەرەوە لێرەدا

لەوەزیاتترباسکردنی ناگونجێت.

وەقفکردن

---

[9] _ کاتێ کەئێمە لەکۆمەڵگای ڕانیە ساڵی1989 ئەم پەڕاوەم نوسی وبەم شێوەباسی جگەرەم کردلەپێش ئەمیشدا نامیلکەی(جگەرەدژی ئازادیە)مان نوسیبو لەلای هەندێك وابووکەجگەرەبەوشێوەیەش نیە وائێستاکەئەم پەڕاوەبۆچاپی دووهەم ئامادەئەکرێت نەك مسوڵمان کافرانیش دژی جگەرە وەستاون ولەزۆربەی وڵاتانیاندالەچێشخانەکانیانداکەگۆشتی سەگ وبەرازو...هتد ، تێدائەخۆن جگەرەیان تێداقەدەغەکردووە.

وەقف، گیردانی ماڵێکە کەسودی هەبێت لەڕێگای حەڵاڵداوئەسڵی ماڵەکە، بمێنێتەوە. وەقفکردن، نیشانەی باوەڕی ڕاستەبەخوای تاك وتەنیاو هاتنی ڕۆژی قیامەت وەدەستکەوتنەوەی پاداش وبەڵگەی دڵسۆزی وەقفکەرەسەبارەت بەغەیری خۆی، ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆرسورە لەسەر ماڵ بەخشین وپێی خۆشە کەس لەوماڵ بەخشینەکۆتایی نەکات، جائەگەربەخشراوەکە درێژخایەن بێت چاکترە وتابمێنێتەوەوسودی لێ وەرگیرێت خاوەنەکەی والەقازانجابالەسەردنیاش نەمابێت، بەڵێ ئاینی روح پەروەرومرۆڤ ناس وەك دژی عەنبارکردنی سامانەناڵێ بەکابرای خاوەن دەسەڵاتیش بێ منەت بەوئەبێ لێت وەرگیرێت، بەڵکو هەڵی ئەنێ کەخۆی ئەوماڵەببەخشێت وبەڵێنی پاداشتی گەورەی پێ ئەدات کەلای خوا دەبەرانبەرە، کەوابوماڵەکەی خۆی بەهەوانتەنەداوە بەڵکوبەتەمای زیاترە و وایش ئەبێ، چونکە بەڵێنی لەکەسێك وەرگرتووەکەدژی بەڵێنی خۆی ڕەفتار ناکات، بەڵێنی بەوزاتەداوەکەهەمووشت موڵکی ئەوە، وەقف بەشێکە لەوچاکانەی کەپاش مەرگی کابرا دەمێنێ وهەتا ئەوشتەبمێنێ وەکوکابرا مابێ هەرچاکەی بۆئەنوسرێت، لەم بارەوە پێغەمبەری مەزن(ﷺ)ئەفەرموێ(اذامَاتَ ابنُ ادَمَ انقطَعَ عَمَلُهُ الامِن ثَلاثٍ، صَدَقةٍجارية، اوعِلمٍ يُنتَفَعُ بِهِ، او وَلَدٍ صَالِحٍ يَدعُولَهُ)واتە هەرکاتێ مرۆڤ مرد، ئیترکردەوەکانی دوای دێت، مەگەربەهۆی سێ شتەوەنەبێت:

1. چاکەیەك کەدرێژ خایەن بێت وەکودروست کردنی مزگەوت وقوتابخانەونەخۆشخانەوڕێگاوپردوبیری ئاو وباغێك، ئەمانە تاهەن چاکەی کابرابەردەوامە.

2. عیلم وزانینێك کەلەپاش مەرگی کابرا خەڵکی سودی لێ وەرگرێت.

3. منداڵی چاك وخواناس کەلەپاش مەرگی باوکی دوعای خێری بۆبکات. خوێنەری بەڕێز، وەقف چونکە شتێکی زۆرچاکەوبەسودی خەڵکەڕەوایە کەسەرپەرشتی مسوڵمانان بەشێك لەوزەوی وزاروباغاتانەی کەبەغەنیمەت دەستی مسوڵمانان بکەوێت وەقفی بکات، (سوادوالعراق)یەکێکە لەوزەویەوەقفانەکەسێ بەشەبەناوبانگەکەی کوردستان وشتی زیاتریش ئەگرێتەوە، حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ)وەقفی کردووە وەکەس مافی زیادلەخۆی نیەوکڕین وفرۆشتنی بۆغەیری دانیشتوانی خۆی ڕەوانیە بۆزیاترشارەزابون لەم مەسئەلە گرنگە تەماشای پەڕاوەگەورەکانی وەکو(تحفة)ی شێخی ئیبنوحەجەربکە، شتێکی زۆرگرنگەوخەڵك زۆربێ ئاگان لێ ی.

بەخشینی هەرشتێك بازۆرکەمیش بێت هەربەکەڵکە بۆبەخشندەکە بەڵام ئەمیش پلەی هەربەرزو هەرەخواری هەیەلاخوارەکەی لەتێ خورمایەکە لاهەرەبەرزەکەیشی بەخشینی خۆشەویسترین ماڵە، خوای گەورە ئەفەرموێ( لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ )ال عمران/92 واتە: ناگەن بەبەرزترین پلەی بەخشین نانەبەخشن لەوشتانە کەخۆشتان ئەوێن وەهەرشتێ ببەخشن بەڕاستی خوائاگای لێ یەتی مسوڵمانە ڕاست

ودڵسۆزەکانی سەردەمی پێغەمبەر ( ﷺ) ئەڵێن کاتێ کەئەم ئایەتە نازڵ بوو هەروەکو باقی ئایەتە پیرۆزەکانی

ترلەباوەشیان گرت وناوەڕۆکی ئایەتەکەیان بەدڵ وبەگیان قبوڵ کردووئەوانەیان کە بوویان داخوازی ئەم ئایەتەیشیان

بەشێوەیەکی تێروتەواو بەپەلەو بێ وەستان ئەنجام دا، بۆنموونەئەبوتەلحەناوێك کاتێ ئەم ئایەتەی بیست وتی ئەی

پێغەمبەر( ﷺ) خۆشەویسترین ماڵم بیری(حایە)وابەخشیم لەرێگای خوادا. براوخوشکە مسوڵمانەکان، ئاوابوون

مسوڵمانانی پێشوو بۆیەتوانیان بەماوەیەکی کەم ئاڵای ئەم ئاینەپیرۆزە بەرزکەنەوە لەباتی ستەم رق

وقینەودوژمنایەتی دادگەری وخۆشەویستی وبرایەتیو ئاشتی دروست کەن. هیوادارم ئێمەیش رێبازەکەی خۆمان

بناسین وپیاوانە لەورێگاوە دڵسۆزانەوچالاکانەهەنگاو هەڵگرین بەڵکوپەروەردگاربەزەییبەحاڵمان دابێتەوەوجارێکی

تربەئایین بەرزوبەرێزەکەی بەهێزمان بکاتەوە.

ئیش کردن پاداشتی هەیە

ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئیشکردنی بەلاوەزۆربەنرخەوبۆهەمووئیشێك پاداش دائەنێت وئەفەرموێ (لَيْسَ لِلإنْسَانِ إلا مَا سَعَى وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى)النجم( 39-40)واتەئینسان بێ تەلاش وزەحمەت ماڤ هیچ پاداشی نی وەبەرهەمی

هەمووتەلاش وزەحمەتێکی پیشان ئەدرێت و ووناکرێت.

واتە(ئیسلام رازی نیە هیچ کەس بەبێ تەلاش وکۆشش هیچ شتێ وەرگرێت وەهەرکەسێکیش ئیش بکات ئەبێ

پاداشتی پێ بدرێت مەگەر، توانای کاروکۆششی نەبێت.

تێ بینی

بەشی یەکەمی ئەوئایەتەی سەرەوە( لَيْسَ لِلإنْسَانِ إلا مَا سَعَى )ئەوەمان تێ ئەگەیەنێ هەرکەسێك ئیش نەکات نەخوات

ومانایەکی گشتی وفراوانەولەبەرانبەریەوە وەئایەتی(ثُمَّ رَدَدْنَاهُ أَسْفَلَ سَافِلِينَ (5) إلا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَلَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ )التين/ 6 ماناکەی بەرتەسك ئەکاتەوە، واتە: هەمووکەس ئەهێنینە خوارەوەبێجگەلەوانەی کەباوەڕیان

هێناوەوئیشی چاکەئەکەن، ئەوانە پاداشتی کاتی گەنجی وبەدەن ساغی وبێ ئیشیان بۆئەنوسرێت،

جاهەروەکوپاداشتی قیامەت دنیاش هەربەوچەشنەیە، ئەوانەی کەژیانی خۆیان لەبەربێ هێزی ولاوازی ونەخۆشی

بۆدابین ناکرێت ئەبێ ژیانیان بۆدابین بکرێت، بەتایبەت خۆراك وپۆشاك وجێگای حەسانەوە.

باوك ئەتوانێت ماڵی کوڕی خۆی بخوات، چونکە پێغەمبەری مەزن( ﷺ)ئەفەرموێت( انتَ وَمَالُكَ لابيكَ )واتە خۆت

وماڵەکەت هی باوکتی،بەکورتی پێویستەژیانی هەموومرۆڤێك بەتایبەت پۆشاك وخۆراك وجێگای حەسانەوە دابین

بکرێت وهەرکەسێك توانای ئیشی هەبێ نابێ بەتەمەڵی لێی پاڵ داتەوەوچاوەڕێ بکات. بەشی دووەمی ئایەتەکە( وَأَنَّ

سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى )واتە بەڕاستی پاداشتی کۆششەکەی خۆی لەمەولائەبینیٚ وهیچی لیٚ حەشارنادریٚ ودژی هەمووجۆرە

دەست بەسەراگرتن وسودبردنێکە(الاستعماروالاستثمار)

چونکەماوەنادات ئیشی کەس بەلاش بێت ووسودی بۆکابرای زەحمەت کێش نەبێت. بۆیە پێغەمبەری

پایەدار(ﷺ)زۆرتوڕەیەلەنەدانی حەقی کرێکاروئەفەرمویٚ( ثلاثة أنا خصمُهُم يوم القيامة رَجُلُ أعطى بي ثم غَدَر ورَجُل باع

حُرأًفأكل ثمنه ورجُل استوفىَ ولم يُعطه اجره)البخارى . واتە:سیٚ کەس هەن کەڕۆژی قیامەت من دژایەتیان لەگەڵا ئەکەم

ولەدادگای گەورەولەپێش دەم خوادا لەدژیان ئەدووم، یەکەمیان ئەوکەسەیەکەپەیمان بدابەخواو لەپاشان

پاشگەزببێتەوە، دووهەمیان ئەوکەسەیە کەمرۆڤێکی ئازادبفرۆشێت پارەکەی بخوات وای بۆئینسان چەندخۆی بیٚ

نرخ ئەکات خەڵك ئەفرۆشرێت تاخۆی دەوڵەمەندکات یابۆئەوەی منالّی خۆیبژیت منالّی خەڵك هەتیوئەکات، وای

ئینسان وەختیٚ لات دا لەبەرنامەکەی خواچەنددرندەیت؟! بەڕاستی ئینسان ئەگەرلەیاسای خوالای دا لەچواریێ لاسار

تروبیٚ ئەخلاق ترونەزانترە( أُولَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ )الاعراف/ 179. ئەگەربیٚ باوەڕێك ئەم قسەیەی لاوانیە باخۆی

وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە، تۆنیت پیاوەکوژیت بۆدەست کەوت؟ یابۆژیانی خۆت ئامادەی لابردنی سەدان ژیان

نیت؟ بۆخۆش گوزەرانی منالّی خۆت دەیان منالّ بیٚ سەرپەرشت وهەتیوکەیت؟ئەی بۆئافرینێك دەیان هاونەوعی

خۆت دوچاری بەندی خانە ناکەیت؟ تابڵێن کوری چاکەبەزمانی لوست دەیان کەس نائومێدوگرفتارناکەیت؟ ئەی

بۆپارویەك نانی چەورپاسەوانی دوژمنانی ئایین ولاّتت ناکەیت؟!

سیٚ هەمیان/ لەمانای فەرمودەکە ئەوکەسەیە کەئینسانێك بەکریٚ بگریٚ وئیشی پیٚ بکات بەلاّم کرێکەی پیٚ نەدا.

ئەوانەی کەوابەخەڵك ئیش ئەکەن وبەرهەمی عارەقی ناوچاوانی زەحمەتکێشان بۆخۆیان دەبەن وسودی بێجگە

لەخۆیانیان ناوی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەوانە بەخوێن مژ ئەزانێت وبەتوندی دژی ئەوجۆرە هەڵوێستانەیە وماوەنادا

بەوخوێنمژانە کەبەئارەزوی خۆیان ئەسپی خۆیان تاودەن وچەند یاسای بۆبەرگری لەوجۆرە ڕەفتارە ناپەسەندانە

داناوە:-

یەکەم/ نابیٚ زیان بدەیت وزیانت لیٚ بدرێت(لاچرر ولاچرار)الحدیپ بناغەیەکی گشتی شەرعیە.

دووهەم/ زیان ئەبیٚ لابرێت.(اَلضَرَر يُزَالُ)بناغەیەکی گشتی شەرعیە.

سێهەم/ لابردنی زیانیش پێش ئەخرێت لەسەرهێنانی سود.( دَفعُ الضَّرَرِ مُقَدَّمُ على جَلبِ المنفعة ). ئەمیش هەروەها

بناغەیەکی تری گشتی شەرعیە.

چوارەم/ نەستەم بکەن ونەستەمتان لیٚ بکرێت. (لاتظلِمُون ولا تُظلَمُون)البقره(279).

ئەم چواریاسایە هەموچەشنە ستەمێك بەتاوان دائەنێت ودژی هەمووداگیرکردن وبەهرەکێشی وسوك کردن وبەندایەتی وملهوڕیەکە(الاستعمار والاستیمار والاستحمار والاستعباد والاستبداد).

خوێنەری بەڕێز، ئەوەیە یاسای مرۆڤ پەروەری ئیسلام، کام یاسا هەیە لەوچاکتر لایەنگری چەوساوان بێ ودژی خوێنمژان وستەمکاران؟. جاشتێکی بەڵگەنەویستە کەستەمکاران وحوێنمژان وملهوڕان بەم یاسایەڕازی نابن وبەهەموشێوەیەك هەوڵی ئەوەئەدەن کەناشیرینی بکەن لەبەرچاوی خەڵك تابتوانن لەئاوی لێڵ داڕاوی خۆیان بکەن؟!

مرۆڤ لەخەوی بێ ئاگایی هەڵسە بێ ئەوەی کەبەخۆت بزانی چەندین جار فرۆشراویت، ( إِنَّ اللَّهَ لا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ) رعد/11، بەڕاستی ئەڵڵاه، هەرگەلێك چۆن بێت نایگۆڕێت تابۆخۆیان خۆیان نەگۆڕن.

داگیردن(غصب)

ئاینی پیرۆزی ئیسلام ماوەی موڵکیەتی تاکی لەسنورێکی دیاریدا داوە ودژی هەمووچەشنە ستەمێکەو پارێزگاری لەماف خەڵك بەئەرکی سەرشانی خۆی ئەزانێ جا ئەگەرکەسێك کەوتە بەرهێرشی ستەمکاران وتەماعی خراپی تێ کرا، ئیسلام بەوکابرا ئەڵێت پارێزگاری لەماڵی خۆت بکە وەئەگەر شەڕیان لەگەڵ کردی شەڕیان لەگەڵ بکە، ئەگەر داگیرکەر کوژرا خوێنی بەزایە چووە وهیچ کەس ماف ئەوەی نیە لەسەری بێتە جواب وەئەگەر کوژرایت شەهیدی واتە: ئیسلام داوا لەخاوەن ماڵەکە ئەکات کەنەترسێ وپارێزگاری ماف خۆی بکات ومیریش لایەنگریەتی وزەحمەتی داگیرکەر بەفێرۆئەدات وماڵی داگیرکراویش هی خاوەنەکەیەتی جائەگەر ماڵەکە فەوتا لای داگیرکەر ئەوە گران ترین قیمەتی لێ وەر دەگیرێ لەتۆڵەی ماڵ بردن ودروستکردنی نائەمنی داچونکە ئەم ئیشەی داگیر کەر ئەبێتە هۆی بزواندنی هەستی ڕەوشت نزمان وگەل دوچاری ترس ونائاسایشی ژیان ئەکات، خوای گەورەلەبارەی دەستدرێژی وماڵی خەڵك بەناحەق خواردنەوە ئەفەرموێت(وَلا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ)188البقرە، واتە: ماڵی یەکترمەخۆن بەناڕەوا، داگیرکەر هەرکەسێ ببێ وهەرچی داگیربکات لەماڵ وناموس وعەقڵ وبیروڕا تاوانبارە، ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەی کەدژی مرۆڤ بێت وئاسودەیی وئاسایشی خەڵك تێك بدات بەناڕەوای ئەزانێ وهەرگیز لەگەڵیا نەگونجاوەوناگونجێت وەلەزۆربەی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان وفەرمودە بەنرخەکانی پێغەمبەری مەزندا( ﷺ) ئەم ڕاستیە بەیان کراوە، لێرەدادووفەرمودەی پێغەمبەری مەزن(ﷺ)ئەخەینە روتالەم بارەوەچاکتر شارەزابیت.

1. پێغەمبەری دادپەروەر ومرۆڤ دۆست( ﷺ)ئەفەرموێ(( انَّ دِمائكُم وَاموالكُم وَاعرَاضَكُم حَرَامُ عَلَيكُم )واتە بەڕاستی خوێنتان وماڵتان وناموستان لەیەکتر حەرامە، لەم فەرمودەدا گیان وماڵ وناموس کۆکراونەتەوەومسوڵمانانی لێ

قه‌ده‌غه‌كراوه‌ وماڵی له‌نێوان گیان وناموسدا داناوه‌كه‌به‌ڵگه‌یه‌ له‌سه‌ر گرنگی ماڵ له‌ڕوانگه‌ی ئیسلامه‌وه‌وسوری له‌سه‌رپارێزگاری ماڵی خه‌ڵك.

2. پێغه‌مبه‌ری مه‌زن( ﷺ) ئه‌فه‌رموێ( مَن ظَلَمَ قَدرَ شبرٍ مِن ارضٍ طوقَهُ مِن سَبع اَرَضينَ )واته‌: ئه‌وكه‌سه‌ی كه‌به‌ئه‌ندازه‌ی بستێك له‌زه‌وی خه‌ڵك داگیربكات ئه‌وه‌له‌گه‌ڵ هه‌رحه‌وت پارچه‌كه‌ی زه‌وی ئه‌كرێتبه‌هه‌ڵقه‌یه‌ك وئه‌كرێته‌ ملی له‌ڕۆژی قیامه‌تا وده‌بێ هه‌ڵیگرێت، دیاره‌ناتوانرێت وله‌سزادا ئه‌مێنێته‌وه‌تاتۆڵه‌ی لێ ئه‌كرێته‌وه‌، خوێنه‌ری به‌ڕێز ئه‌مه‌ به‌ڵگه‌یه‌كی تربووله‌سه‌رموڵكیه‌تی تاك له‌ئیسلامداوه‌ئه‌گه‌رئه‌م موڵكیه‌تی تاكه‌ به‌ومه‌رجانه‌ی ئیسلام دایناوه‌ نه‌بێت ئابووری وولاّت یاله‌ناوئه‌چێت، یاهه‌ندێك ئه‌بن به‌ملیۆنله‌روخه‌ڵكێكی زۆریش ئه‌بن به‌بێ جێگاورێگاوئه‌بن به‌ئه‌ڵوات وه‌كوئه‌مڕۆله‌به‌رچاوی یه‌كه‌میان وه‌كوده‌وڵه‌ته‌شیوعیه‌كان ودوهه‌میان ولاّته‌سه‌رمایه‌داره‌كانی ڕۆژئاوا، ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاواتی خۆشبه‌ختی وئاسایی خه‌ڵكه‌ ورێگابه‌ده‌ست درێژی كردنه‌سه‌رماڤ خه‌ڵك وداگیركردنی سه‌روه‌ت وسامانیان نادات، وه‌بۆپارێزگاری له‌ماڵ وله‌گیان تیژترین وسه‌خت ترین سزای له‌به‌رچاوگرتووه‌، چونكه‌ ئه‌گه‌رئه‌وپارێزگاریه‌ نه‌بێت له‌ژیانی مرۆڤدابێجگه‌ له‌شه‌ڕو شۆڕو تالاّن وبرۆشتێكی تر وه‌به‌رچاوناكه‌وێت جائیسلام ته‌نهابۆپارێزگاری گیان وماڵ یاسای به‌هێزوتێروته‌واوی داناوه‌به‌ڵكوپێشی وایه‌ كه‌تائه‌ودولایه‌نه‌ دابین نه‌كرێت خواپه‌رستی ڕاست وره‌وان ناكرێت خوای گه‌وره‌ئه‌م ڕاستیه‌ی له‌سوره‌تێكی بچوكی قورئاندا بۆباسكردوین وئه‌فه‌رموێت(لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ (1) إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاء وَالصَّيْفِ (2) فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ (3) الَّذِي أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَآمَنَهُم مِّنْ خَوْفٍ)قریش، واته‌: خواله‌شكری ئه‌برهه‌ی له‌ناوبرد له‌به‌رئولفه‌تی قوره‌یش، ئولفه‌تیان به‌هاتوچۆی زستانان بۆیه‌مه‌ن وهاوینان بۆشام واته‌، تارێزی كه‌عبه‌ پایه‌داربێ وئه‌وان بتوانن له‌وڕیزه‌كه‌ڵك وه‌رگرن وبێ ترس هاتوچۆی خۆیان بكه‌ن وله‌كه‌س نه‌ترسن وپێ بژێوی خۆیان په‌یدابكه‌ن جاكه‌وابوباله‌سوپاسی ئه‌ومیهره‌بانیه‌داخاوه‌نی ئه‌وماڵه‌كه‌خوایه‌ بپه‌رستن ئه‌وخوایه‌ی كه‌له‌برسێتی داخوارده‌مه‌نی بۆناردن وله‌ترسداهێمنی كردنه‌وه‌.

خوێنه‌ری به‌ڕێز، خوای گه‌وره‌ وخاوه‌ن ده‌سه‌لاّت كاتێ كه‌باری ئابووری وڕامیاری قوریشی دابین كردووه‌پێیان ئه‌فه‌رموێ كه‌ئیتر ئێوه‌ش ده‌بێ به‌ندایه‌تی من بكه‌ن وگوێ ڕایه‌ڵی فرمانم بن واته‌، ئه‌ركی سه‌رشانی مسوڵمانه‌ شۆڕشگێڕوتێكۆشه‌ره‌كانه‌ دابین كردنی باری ئابووری وڕامیاری خه‌ڵك وهێمن كردنه‌وه‌ی خه‌ڵك له‌ترس له‌پاشان چاوه‌ڕوانی خوا په‌رستی ڕێك وره‌وان له‌خه‌ڵك بكه‌ن، ئاشكرایه‌ داگیركه‌رهه‌ردووله‌به‌ین ئه‌بات ونرخێك بۆداگیركراودانانێت، ئه‌گه‌رله‌ڕواڵه‌تا لایه‌نی ئابوریه‌كه‌ی چاك بێ ئه‌وه‌فێڵه‌وكوردواته‌نی،(گۆشتی سه‌ری ته‌ڵه‌یه‌)چونكه‌داگیركه‌رچاوچنۆكه‌، ئه‌گه‌رچاوچنۆك نیه‌ بۆداگیركه‌ره‌؟ جا، چاوچنۆك وبه‌خشنده‌؟!!كه‌واته‌، دژایه‌تی

داگیرکەرئیشێکی پیاوانەیەولەبەرژەوەندی هەمووخەڵکە بەگشتی، ئەوەڕێبازی ئیسلامە سەبارەت بەداگیرکەران وداگیرکراوان، دژی یەکەمەولایەنگری دووهەمەوئەوەی کە ئەڵێ وانیەتاقە بەڵگەیەکی نیەچاك ببیٚ خاترجەم.

(المُسلِم اخُو المُسلِمِ لایَظلِمُهُ ولایُسلِمُهُ)مسوڵمان برای مسوڵمانەونەستەمی لیٚ ئەکات، نەئەیداتەدەست ستەمکارەوە.

کڕینەوەی ماڵی هاوبەش(الشفعة)

ئەگەردووکەس یازیاتر لەماڵێکا شەریك بوون وئەکرا بەش کرێت ئەگەر هەرکامیان فرۆشتیان ئەو یان ئەوانی تر ئەتوانن ئەوماڵەبەوقیمەتە هەڵگرنەوەو ئیترفرۆشەر وبکڕ ڕازی بن یانەء چونکەئەم هەڵگرتنەوەکەمترقەپوقاڵ وهەرای تیائەبیٚ چونکەموڵکیەتی لەبەشێکا کۆترە، بەومەرجەی هەرکەزانی بەپەلەوبیٚ دواکەوتن ئەومامەڵەیە قەبوڵ کات بۆخۆی، نرخەکەی هەرچەندوهەرچۆن ببیٚ پێویستەجیٚ بەجیٚ ی بکات، بەڵام ئەگەرجیاکرابونەوەوسنورلەنێوانیاندابوئەوەئیتر هاوسێیەوئەومافەی نیە ئەگەرچی چاك وایە کاتی فرۆشتن پێی بوترێت تائەگەرویستی، بیکڕێت وڕێك بکەون تادڵ گران وسەغەڵەت نەبیٚ وبرایەتیان لاوازنەبێت.

بارمتە(رهن)

یەکیٚ ترلەوبەڵگانەی کەئەبێتەهۆی دان پێدانانی موڵکیەتی تاك بارمتەیە، ئاینی ئاشتی خوازی ئیسلام بۆدورخستنەوەی خەڵك لەقەپوقاڵودڵ عاجزبوون وپاراستنی ماڵەکانیان وباوەڕکردنیان بەیەکترویارمەتی یەکتردان بارمتەی بەشتێکی ڕەواداناوە بەم مەرجانەی خوارەوە:-

1. بارمتە بریتی یە لەوەی کەکابرایەك پارەیەکی پێویستەوئەگونجیٚ باوەڕی پیٚ نەکرێت وئەوپارەیەی بەقەرز نەدرێتیٚ لەبەرئەوە خانویەك یان ئەرزێك یان شتێکی ترکەلەنرخی پارەکەکەمترنەبێت بداتەدەستی خاوەن پارەکە کەبەوئیشەئەوترێت(ڕەهن)وبەوشتەیش کەئەدرێت پێی ئەوترێت(مرهون)بەکابرای خاوەنپارەکەئەوترێت(مرتهن)وبەخاوەن خانووئەرزەکەش ئەوترێت(راهن).

2. ئەوماڵە ڕەهن کراوە هەرهی خاوەنەکەیەتی ولەموڵکی ئەودەرناچێت چونکە پێغەمبەرئازیزمان( ﷺ )ئەفەرموێت( لایُغلَق الرهنُ من صاحبِهِ الّذی رَهَنَهُ لَهُ غُنمُهُ وعَلَیه غُرمُهُ )واتەڕەهن نابێتە هۆی ئەوەکەماڵەکە لەدەست خاوەنەکەی خۆی دەرچێت سودەکەی هەربۆئەوەوهەروەها زیانەکەیشی، واتە ئیجارەی خانووی ڕەهن کراو بۆخاوەنەکەی ئەبێت ونابیٚ خاوەن پارەکە وەری گرێت چونکە ئەوەئەبێت بەسوخۆری وەئەوخانوودوکان وشتەی ترکەلەڕەهندا بێت وەك سودەکەی بۆخاوەنەکەیەتی هەروەها زیانەکەشی هەرلەسەرخۆیەتی ئەم بارمتەیە

تەنها بۆئەوەیە کەکابرای پارە دەردڵنیا ببێ لەوەی کەپارەکەی نافەوتێ وئەگەرنەیدایەوەقازی ئەتوانێ ماڵەکە بفرۆشێ بەقیمەتی ئەوکاتەوپارەی خاوەن پارەکەی لێ بداتەوەوهەرچی مایەوەئەبێ بدرێتەوە بەخاوەنەئەسڵەکەی(الراهن).

3. ئەبێ ئەورەهنە بۆشتی حەلاڵ بێ و ماوەکەیشی دیاربێ.

4. ئەبێ ئەورەهن کراوەیش شتێکی حەلاڵ بێت.

5. ئەبێ ئەوبارمتەیە بدرێتە دەست خاوەن پارەکە.

تێ بینی

ئەگەرئەوشتەبارمتەبراوە وولاخی سواری بوو یان حەیوانی شیرداربووئەوەکامیان سودلەسوارییەکەی یان شیرەکەی وەرئەگرن خەرجی حەیوانەکەیش ئەکەوێتە سەریان چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ)ئەفەرموێت: (الّظهرُ يُركبُ بنفقته ولَبَنُ الدَّريُشرَبُ بنَفَقَته اذا كان مرهونا وعلي الَّذى يَركَبُ ويَشرَبُ الَّنفقة). واتە: ولاخی سواری سودی لێ وەرئەگیرێت بەومەرجەی خەرجی بدرێت هەروەهاشیردارشیری ئەخورێتەوە، بەومەرجەی خەرجی بدرێت ئەگەربارمتەبو وەئەوخەرجیەش لەسەرئەوکەسەیەکەسواری ئەبێ وشیری ئەخواتەوە، ئیترلێرەدائەگەرخاوەن پارەکەیش بێت نابێ بەسوخۆریچونکە خەرجی بۆحەیوانەکە ئەکات هەرلەم بارەوە بناغەیەکی فیقهی هەیەئەڵێ(الغُنمُ بالغُرمِ)سودبەبۆنەی زیانە.

بەڵێ ئیسلام ئەوبەشەیەشی ماوەپێداوە تاکەس ماڵی نەفەوتێت وبەهەردم نەڕوات.

وون بوون

دروستە کرێ دانان بۆکەسێك کەبەدوای شتێکی ون بوودابنێرێت، جائەگەرشتەکەی هێنایەوە بۆخاوەنەکەی ئەبێ کرێ کەی پێ بدرێت، ئەبێ ئەوکرێ یەلەپێشدا ڕۆشن کرێتەوەتالەپاشا قەپوقاڵی لەسەرنەبێت.[10] وەلەبەرنیزاع وهەراوبەزم هەندێ مامەڵە لەڕوانگەی ئیسلامەوە بەناڕەواوحەرام باس کراون وەئەگەر کەسێك بڵێ من ئەم جۆرە مامەڵانە ئەکەم ونیزاع لەگەڵ هیچ کەسیشاناکەم،یەکەم بڕیارێکی گومانیەو دووەم یاسای گشتی بەتاکێك هەڵ ناوەشێتەوە*.

[10] – ئەم باسە لەپەڕاوەفیهقیەکاندا بەناو(جعالە)وەبەدرێژی باس کراوە.

* تەماشای باسی (ئیسلام ئاشتی خوازە بکە لەوێدا هەندێ لەومامەڵە قەدەغانە باس کراوە.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام داوا لەخەڵك ئەكات كەیەكتریان خۆش بوێ وسودوقازانجی یەكتریان بوێ ولەمامەڵەدا لێ بووردنیان هەبێت، پێغەمبەری مەزن( ﷺ)لەم بارەوەئەفەرموێت( رَحِمَ اللهُ عَبداً سَمحاً اذا باعَ واذا اشتري واذا اقتضي )واتە، ڕەحمەتی خوا لەوبەندەبێت كەلێ بوردنی هەبێت لەكاتی فرۆشتن وكڕین وداواكردنی قەرزدا.

ئەگەرچی ئیسلام ڕێگای چەندوچۆنی داوە لەمامەڵەدا بەڵام ناگاتە پلەی ئەوڕەحمەتەلەوزبانەپاكەوە، ئاشكرایە ئەگەر ئەم لێ بوردنەهەبێت كۆمەڵ لەگەلێك ڕەوشتی ناڕەواوناپەسەند دوورئەكەوێتەوە بەڵام ڕكەی زۆرو دڵ وزبان پیسی خەڵك ئەبێتە هۆی درۆكردن وسوێندی ناڕەوا خواردن كەدووخوی ناپەسەندو ناڕەوان، لێرەدا نموونەی مسوڵمانێك لەناوكۆمەڵێكی ڕاستەقینەی ئیسلامتان بۆباس ئەكەم، هیوادارم كۆمەڵە دنیا پەرس وبێ ڕەحمەكەی ئەمڕۆمان ئاوڕێك لەخۆیان بدەنەوەو وتەماشای مسوڵمانی ڕاست وئیسلامیەتەكەی خۆیان بكەن، جارێك مسوڵمانێكی دوكانداری كراس فرۆش كەدووجۆركراسی ئەبێ یەكێكیان بەچوارسەددرهەم وئەوی تریان بەدووسەد درهەم دەبێ، جارێك بۆمزگەوت ئەچێت كوڕێكی لەسەردوكانەكە ئەبێ ویەكێ لەكراسەدوسەد درهەمەكە ئەدا بەچوارسەددرهەم بەكابرایەك وكابرا ڕازی ئەبێ وئەچێت، خاوەن دوكان لەمزگەوت دێتە دەروچاوی بەكابرای كراس كڕ دەكەوێت وكراسەكە ئەناسێتەوەولێ ی ئەپرسێت بەچەندت كڕیوە كابرا ئەڵێ بەچوارسەد درهەم، ئەڵێ كاكە ئەوكراسە دووسەد درهەمە، خەڵەتاوی، وەرەلەگەڵم بابیبەینەوە ئەڵێ كاكە لەلای خۆمان شەش سەد درهەم ئەكات، ئەڵێ كاكە وەرە لەگەڵم بابیبەینەوە كابرا ئەباتە سەردوكانەكەی خۆی وتوڕەئەبێت لەكوڕەكەی كەبۆچی كراسی دووسەد درهەمت بەچوارسەد درهەم فرۆشتووە؟ كابرا ئەڵێ كاكە من خۆم ڕازی بوم، مسوڵمانە دوكاندارەكە دوسەد درهەمەكەی پێ ئەداتەوەوئەڵێ، كاكە تۆڕازیت من ڕازی نیم، چونكە من بۆخۆم ئەوەندەی پێ نادەم، جاچۆن بەوپارەزۆرە بیدەم بەتۆ؟

خوێنەری بەڕێز، ئەوەیەكۆمەڵی كوسوڵمانی ڕاست، كەلاپەڕەكانی مێژوو هەزاران شتیان لەم بابەتە تۆماركردووە، چونكە ئەوان بەڕاستی مسوڵمان بوون نەبەتەسكەرە وەك ئەمڕۆی ئێمە ئەوان ڕەحمەتی  پێغەمبەری مەزنیان نەئەگۆڕیەوە بەهەموودنیاو ئامادەبوون بۆئیش وڕەفتاركردن بەهەمووفەرمودەكانی وئیشی هەریەكەیان مانای ئیسلام بوو كەڕەفتاری ئەومسوڵمانە دوكاندارە بەشێك بوولەوفەرمودەیەكە  پێغەمبەری خوا( ﷺ)ئەفەرموێت(لايُؤمنُ اَحَدُكُم حتيَّ يُحِبَّ لاخيهِ مايُحِبُّ لِنَفسهِ)واتە، هیچ كامتان باوەڕتان نیە تائەوەی بۆبراكەتان پێ ی خۆش بێ، ئەوەبێ كەبۆخۆتان پێتان خۆشە. ئاشكرایە هیچ كەس زیانی بۆخۆی پێ خۆش نیە جاچۆن پێ ی خۆشە بۆمسوڵمانان؟ هەروەها هەموكەسێك بۆخۆی سودی پێ خۆشە هەروایش بۆهەموو مسوڵمانان سودی پێ خۆشبێ.

براوخوشکە مسوڵمانەکان تەماشای هەرگۆشەیەك لەگۆشەکانی ژیان بکەیت ئەبینی ئاینی پیرۆزی ئیسلام هیچ گۆشەیەك لەگۆشەکانی ژیانی ئینسانی لەبیرنەچوەوبۆهەموولایەنێکی یاسایەکی تێروتەواوی بۆداناوە، ئەم شتانەی کەئێمە لێرەداباسمان کردن تەنها بیرخستنەوەیەکەوهیچی تر، ئەگینا هەرباسێك لەوباسە کورتەی ئێمە لەدەیان لاپەڕەداجێگای نابێتەوەئەگەربەتەواوی باس کرێت ئێمە لێرەدا مەبەستمان ڕۆش نکردنەوەی لاوەمسوڵمانەکانە وپیێشاندانی هەڵەوغەڵەتی هەڵخەڵەتاوان، ئەوانەی کەعاشقی بەرنامەی سەرمایەداری ڕۆژئاوایابەرنامەی کۆمۆنیستی ڕۆژهەلات بوون!!کەهەردوکیان لەڕوانگەی ئیسلامەوە دژی مرۆڤایەتی وهەستی ئازادی خوازی وگەشەو پیٚ گەیاندنی ڕۆحی برایەتی ویەکسانین.

بەڕێزان لێرەدا لەبەرکەمی بەرهەمی بیٚ بەرهەمان خواحافیزی لەکەم بەرهەمان ئەکەین وبەرەو سفرەوخوانی بەرهەمداران ڕوئەکەین ولەبەربیٚ سوپاسیان زۆری بەرهەمیان لەقاوئەدەین جابابەرهەمدران چاك بزانن(ئەگەر کەڵەشێریش نەبێت ڕۆژهەردەبێتەوە).

تائێرە بۆمان دەرکەوت کەموڵکیەتی تاك(فرد) شتێکی پێویستە بەومەرجانەی کەباس کران، لێرە بەدواوە لەسەرهاوبەشی دەدویین.

زەوی بۆهەمووئینسانە:

ئەم زەوی وئاسمان وهەوروباوباران وکان ودەریایانە هەموودروست کراوی خوای خاوەن دەسەڵات ودانان وئێمەیش بەندەی ئەوزاتەین ولەوانەداهەمووهاوبەشین خوای گەورەئەفەرموێت(هُوَ الَّذِي خَلَقَ لَكُمْ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا )البقرە/ 29، واتە: خوائەوزاتەیەکەئەوەی ناوزەوی دروستکردووەبۆهەمووتان، ئەم ئایەتە پیرۆزە هەمووئینسانەکان ئەکات بەشەریك لەدروستکراوەکانی خوداوڕازی نیەهەندیٚ دەستی بەسەردابگرێت وهەندێك لەبرسیاقورتەی سکیان بێت خوای گەورە لەئایەتێکی تراجوانتر ئەم ڕاستیە ڕۆشن ئەکاتەوەو ئەفەرمویٚ( كَيْ لا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ)الحشر/ 7، واتە: دەسکەوتتان دابەشبکەن تالەدەستدەوڵەمەندەکانتاندا کۆنەبێتەو، بەم شێوەیە دەردەکەوێت کەئیسلام بەسەرمایەداری ڕازی نیە، هەروەکو بەکۆمۆنیستی ڕازی نیە، بەڵکو خاوەنی بەرنامەیەکی مام ناوەندی یە(وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا )البقرە/ 143، واتە: وەهەروەها ئێوەمان کردوەبەگەلێکی مام ناوەندی، ئەمەبووبەڵگەی یەکەم.

بەڵگەی دووەم لەسەرناڕەزایی ئیسلام بەسەرمایەداری، دابەش کردنی کەلەپورەوگەڕانەوەی زیادەکەیەبۆماڵی گشتی.

بەڵگەی سێیەم، بێزاری ئیسلامەلەکۆکردنەوەوعەنبارکردنی سەروەت وسامان.

بەڵگەی چوارەم، مانای ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کەخوای گەورە ئەفەرموێت(وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ)النحل/71.

ڕەوشت وباوی خوا لەم بونەوەرەدا وایەکەئینسانەکان تاقی بکاتەوە تاڕۆژی دوایی کەس بەهانەی نەبێت بۆنموونە، هەندێك فەقیرئەکات تاکابرا خۆی بۆخۆی دەرکەوێت کەئایالەم حاڵەتی کەم دەستی ونەبونیەدا ئەرکەکانی سەرشانی خۆی سەبارەت بەخەڵك وخوابەڕاستی وبێ فێڵ وفڕ ئەنجام ئەدات یاهەرخەریکی فێڵ وفرودرۆوخیانەتەبۆخۆڕزگارکردن لەوحاڵەتە کەم دەستیەو باوەڕی بەوتاقیکردنەوە نیەوپێ ی وایە بەوشێوەیە ئەتوانێ خۆی لەوبارودۆخەرزگارکات وهیچ شتێکی تربێجگەلەئیش وکاری خۆی لەئارادانیەوەهەندێك دەوڵەمەندئەکات دیسان ئەویش بۆتاقیکردنەوەیەتابزانرێت بەوماڵەچی گۆڕان کارییەك هاتوەبەسەربیروڕاوهەڵس وکەوتیاوچۆنی خەرج ئەکات؟ کەوابووبەرزکردنەوەی خەڵك بەهۆی ڕزق وڕۆزییەوەونزم کردنەوەیان تەنها بۆتاقیکردنەوەیەوهیچی تر، ئەگیناتاڕۆژێك تەمەنیان مابێ هەردوو هەرئەژین وەئەگەرماوەی ژیانیشیان نەمێنێ هەردووهەرئەمرن، واتە: نەنەبونی سامان تەمەنی کورت کردن وەنەبونی سامان عومری درێژکردن، نەبونی سامان بەڵگەی خۆشەویستیە، نەنەبونی نیشانەی ناخۆشەویستی یەلای خوا، خوای گەورەئەم بۆچونەڕۆشن ئەکاتەوەوئەفەرمویت(فَأَمَّا الانْسَانُ إِذَا مَا ابْتَلَاهُ رَبُّهُ فَأَكْرَمَهُ وَنَعَّمَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَكْرَمَنِ (15) وَأَمَّا إِذَا مَا ابْتَلاهُ فَقَدَرَ عَلَيْهِ رِزْقَهُ فَيَقُولُ رَبِّي أَهَانَنِ (16) كَلَّا بَلْ لا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ (17) وَلا تَحَاضُّونَ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ (18) وَتَأْكُلُونَ التُّرَاثَ أَكْلاً لَمًّا (19) وَتُحِبُّونَ الْمَالَ حُبًّا جَمًّا)الفجر/15-20.

واتە، کاتێك کەخوائینسانی تاقیکردەوەبەم ڕەنگەڕێزی گرت وبەهرەی بەسەرا ڕشت ئەڵێ، خواڕێزی لێ گرتووم، وەئەگەرکاتێك تاقیکردنەوە بەم ڕەنگەکەڕۆزی لێ گرتەوە ئەڵێ، پەروەردگارم ڕیسوای کردم، نەءوانیە کەتێ گەیشتوی بەڵکو ئێوەڕێزی هەتیوان ناگرن ویەکترهەڵنانێن لەسەرخواردەمەنی دان وبەخێوکردنی هەژاران وکەلەپورئەخۆن بەبێ تەماشاکردنی حەقی حەقداران وەماڵتان خۆش ئەوێ بەخۆشەویستیەکی زۆروهەرلەبیری ئەوەدان، بەشێوەیەك کەیاسای ئەم بونەوەرەتان بەخەیاڵدا نایەت وهیچ کات لەبیری بەندایەتی خواو خزمەتی خەڵکانین، ئینجا تەماشای مانای ئایەتی پێشووبکەکەخوادەفەرمویت( وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُوا بِرَادِّي رِزْقِهِمْ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ )واتەخوائەوزاتەیە کەهەندێکتان لەهەندێکتان جیائەکاتەوە بەهۆی ڕۆزی یەوە(لەبەرئەوتاقیکردنەوەی کەوترا)لەگەڵ ئەوەدا کەئێمە ڕۆزیمان پێداوەکەچی هیچ نادات بەژێردەستەکانی خۆی، ئەوانەکەنیعمەتەکانی ئێمە کردونی بەبەندەی تائەوان لەوماڵەداوەکو یەك بن، دیارە ئەم

مرۆڤە لەتاقیکردنەوەدا دەرنەچووە، چونکە وائەزانیٚ کەخۆی خاوەنی نیعمەتەکەیەوشایستەیە، بۆیە هەیەتی،

بۆیەخوای گەورەبەتوڕییەوەئەفەرمویٚت( أَفَبِنِعْمَةِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ )؟ ئایائێوە دان بەنیعمەتەکانی خودانانێن؟

ئەگەروانیەبۆخەڵکی تربەهاوبەشی خۆتان نازانن؟ ئەی بۆئاوڕلەبێنەوەیان نادەنەوەوائەزانن هی خۆتانە؟ بەڕاستی

بۆچونەکەتان زۆرهەڵەیە، ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەگەرچی مانای تری لیٚ دراوەتەوە بەڵام خۆناکریٚ ئەم مانیایە بشاریٚتەو.

لەم ئایەتەپیرۆزەوە دەرئەکەویٚت کەهەمووخەڵك لەبەهرەکانی زەوی دا شەریکن(فَهُمْ فِيهِ سَوَاءٌ).

بەڵگەی پیٚنجەم/ لەسەرهاوبەش بوونی ئینسانەکان لەسەروەت وساماندا ئەم ئایەتەیەکەخوای گەورە

ئەفەرمویٚت( يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ )البقرە/ 219، واتە: پرسیارت لیٚ ئەکەن ئەی موحەمەد( ﷺ )کەچ شتیٚك

ببەخشن؟ بلیٚ، ئەوەی زیادەیەلەخۆتان بیبەخشن. پرسیاری ئەوان لەچەشنی شتەکانە. بەڵام گرنگ ئەوەنیە کەچ

شتیٚك بیٚت، گرنگ ئەوشتەیەکەزیادە لەخۆت، وەسنووری ئەم زیادەیەش لەباسی ئاڵتون وزیوعەنبارنەکەیت لەمانای

ئەوفەرمودەدا کەپیٚغەمبەر(ﷺ)ئەفەرمویٚت: (یاابن ادمٚ انَّك ان تبزُل الفچلٚ خیرُلَّكٚ.)دا، باسمان کرد کەماوەی پیٚویست

ساڵیٚکە بەومەرجە کەخەڵك زۆرلەتەنگانەدا نەبن ئەگینا حەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لیٚ بیٚ)ساڵەگرانیەك فەرمووی

هەرکەسیٚك تیٚری سکی خۆی هەیە، نیوەی بخوات، نیوەکەی تربەوکەسانەبدات کەنیوەتیٚریان نیە.

بەڵگەی شەشەم/ لەسەرهاوبەشی ئینسان لەسەروەت وسامانی زەوی دا هیٚرشی توندوتیژی ئیسلامە بۆسەرماڵ

پەرستان وکۆکەرەوانی ماڵ کەلەم سورەتەداخوای گەورەهەڕەشەیان لیٚ ئەکات وئەفەرمویٚت(بسم الله الرحمن الرحيم )(

وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ (1) الَّذِي جَمَعَ مَالاً وَعَدَّدَهُ (2) يَحْسَبُ أَنَّ مَالَهُ أَخْلَدَهُ (3) كَلاَّ لَيُنبَذَنَّ فِي الْحُطَمَةِ (4) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ

(5) نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ (6) الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الأَفْئِدَةِ (7) إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ (8) فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ)سورەتی همزە.

واتە، وای جەهەنم بۆهەمووتانەوتەشەدەریٚك کەهەمیشەخەریکی کۆکردنەوەی ماڵەوهەرخەریکی ژماردنیەتی،

وائەزانیٚ کەئەوماڵەئەیهیٚڵیٚتەوەلەدنیاویادی قیامەتی لەبیربردووەتەوەبەڵکوهەمووئاواتیٚکی بەدەستهیٚنانی ماڵ

وکۆکردنەوەیەتی، وائەزانیٚت کەمەرگ نیەو حیساب وکیتابیٚك لەئارادانیە، بەخەیاڵی خۆیان ئازادانە ئەژین بیٚ ئاگان

لەوەی کەخۆیان کردووە بەبەندەی ئەوماڵ وسامانەوبۆکۆکردنەوەوپاراستنی هەموشتیٚکی خۆیان لەناوئەبەن

هەرلەژیٚری و ڕەوشتەوهەمووگیان ودین بۆیە پیٚغەمبەری پایەبەرزیش( ﷺ )لەم جۆرەکەسانەتورەیەوئەفەرمویٚ ( بِئسَ

عَبدُالدينار، بِئسَ عَبدُالدرهَمِ )پیسەبەندەی دیناروو، پیسەبەندەی درهەم، خۆشویستنی ماڵ وکۆکردنەوەی وعەنبارکردنی

ئەوەندەناشیرینە بۆیەخوای گەورە بەتوندی دەم کوتیان ئەکاتەوەوئەفەرمویٚ(کلاّ)واتە، نەکەن شتی وا، جابادڵنیابن

کەبەبۆنەی ئەوکرداروڕەفتارە ناشیرین وناپەسەندەتانەوە، ئەخریٚنەناوهاریٚنەرەوەتۆنەی (موحومەد)نازانی

ئەوهاڕەڕەچیە؟ ئاگرێکی هەڵگیرێنراوی خوایە ئەدات بەسەردڵەکاندا کەکەنگای ئەوڕەفتاروهەڵوێستەپیسانەیە،

ئەودڵانەی کەهەمیشە لەبیرکۆکردنەوەی سەروەت وساماندا بوون وایان ئەزانی کەئەوسەروەتەلەهاتنی

ئەوڕۆژەولەمردن دوریان ئەخاتەوە!!

نەخێر ئاواتیان نەهاتەدی ومردن وخرانەناوئاگری هەڵگیرساوی هێزودەسەڵاتی خوابەبۆنەی ئاگری هەناسەی بێ

دەسەڵات وهەتیوان وبێ سەرپەرستانێك کەئەوان ئەیان دین و گوێ یان پێ نەئەدان وئەوئاگرەدا ئەخرێت لەسەریان

ولەناوکوڵەکەیەکی ئاگردا تەتەرپێچ ئەکرێن.

بەڵگەی حەوتەم/ لەسەربێژاری ئیسلام سەبارەت بەشاردنەوەوعەنبارکردنی ماڵ وبەڵگەی هاوبەشی ئینسانەکان

لەسامانی زەوی دا ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کەخوای گەورە ئەفەرموێت( فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ (4) الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلاتِهِمْ سَاهُونَ (5)

الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ (6) وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ (7)الماعون4-7، وای جەهەنەم وسزابۆئەونوێژکەرانەی کەنوێژەکانیان دوائەخەن

وەئەوانەی کەواڕوپامای دەکەن وەئەوانەی کەشتی پێویستی خەڵکیان لاهەیەولێیان ئەشارنەوەوپێیان نادەن ئەم

ئایەتە پیرۆزە هەمووشتێکی پێویست ئەگرێتەوەهەرلەدەرزیەکەوە بگرە هەتا سەیارەیەك وەئەگەرهەموومرۆڤەکان

هاوبەش نین چۆن ئەوسزاگەورەیەی بۆدانراوە؟ ئەگەرهەربەخشین وخێربێت کەئیشێکی سوننەتە، لەسەروازهێنان

لەسوننەت تۆڵەوسزانیەکەوابوولابردنی پێویستی موحتاجان فەرزەو وازهێنانی تاوانەوهۆی ڕق وقینی خواوسزایە،

وەمادام فرمانی خوالەسەرئەوهاوبەشەیەهیچ کەس خاوەنی ئیختیارنیە(وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا

أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ)الاحزاب/36، واتە، بۆهیچ پیاوێکی خاوەن باوەڕوبۆهیچ ژنێکی خاوەن باوەڕ ئارەزۆکاریەك نیە

وەختێك خواوپێغەمبەرەکەی( ﷺ )بریاریان دا، جاچۆن کەسێك خۆی بەمسوڵمان بژمێرێت

وکۆشکوتەلاربرازێنێتەوەوگەورەترین بوغازەی هەبێت وبەنرخترین سەیارەی لەژێرپێدا بێت بەڵام برامسوڵمانە

دراوسێکەی نانی شەویشی نەبێت؟؟!

بەڵگەی هەشتەم/ لەسەربێژاری ئیسلام لەکۆکردنەوەی سامان وبەڵگەیەلەسەرهاوبەشی خەڵك لەهەمووکان وسامانی

سەرزەوی ئەم فەرمودانەی  پێغەمبەری مەزنە(ﷺ):

یەکەم/ (انَّ في المالِ حقٌّ سوى الزكاةِ)واتە، لەماڵدابێجگە لەزەکات مافی ترهەیە.

دووه‌م/ پێغه‌مبه‌ری مه‌زن(ﷺ)ئه‌فه‌رموێت( لیسَ لابنِ ادمَ حقٌ في سوى هذه الخِصالِ بَيتُ يَسكُنُهُ وثَوبُ يُواري عَورتهُ وَجَلفُ الخُبزِ والماء).*

سێیه‌م/ فه‌رموده‌ی پێغه‌مبه‌ری مرۆڤ په‌روه‌رودڵسۆزه‌(ﷺ)سه‌باره‌ت به‌ئه‌شعه‌ریه‌كان، كاتێ كه‌خواردنیان كه‌م ئه‌بوه‌وه‌ له‌غه‌زایاله‌ماڵ، هه‌مووخۆراكیه‌كانی خۆیان كۆئه‌كرده‌وه‌وله‌پاشاوه‌كیه‌ك له‌نێوان خۆیاندا به‌شیان ئه‌كرد(فَهُم مِني وأنا مِنهُم)ئه‌وان له‌منن ومنیش له‌وانم.

چواره‌م/ هاوبه‌ش كردنی پێغه‌مبه‌ری مه‌زن( ﷺ) له‌نێوان كۆچه‌ریه‌كان ویارمه‌تی ده‌ره‌كاندا(المهاجروالانصار).

ئه‌وه‌بووپێغه‌مبه‌رویاره‌كۆچه‌ریه‌كانی كاتێ چوونه‌ مه‌دینه‌ هیچ سه‌روه‌ت وسامانێكیان پێ نه‌بوو، پێغه‌مبه‌ر( ﷺ) هه‌ركۆچه‌ریه‌كی دانا به‌برای یارمه‌تی ده‌رێك وله‌ماڵیان كردنی به‌شه‌ریك، جابچن هه‌مولاپه‌ره‌كانی مێژووهه‌ڵده‌نه‌وه‌ بزانن بێجگه‌ له‌ئیسلام له‌كام ڕێبازویاسایه‌كی تردا شتی واكراوه‌ ده‌ی ئه‌وانه‌ی كه‌لاف هاوبه‌شی(اشتراكی)لێ ئه‌ده‌ن ئه‌گه‌ر ڕاست ئه‌كه‌ن ومه‌به‌ستێكی تایبه‌تی تریان نیه‌ بۆناكه‌ونه‌ شوێن ڕێبازه‌كه‌ی پێغه‌مبه‌رویاره‌به‌وه‌فاكانی؟!! بۆبه‌قسه‌ی ئه‌م وئه‌و(ئه‌خڵه‌تێن)وكام ڕێبازێك ئاواهاوبه‌شه‌یه‌كی پاك وخاوێنی بۆخه‌ڵك داین كردوه‌؟؟

پێنجه‌م/ فه‌رموده‌ی دژی ماڵ شاردنه‌وه‌ی ئه‌وكه‌سه‌یه‌كه‌ماڵ هه‌ڵئه‌گرێ بۆگرانی( بِئسَ العَبدُ المُحتَكِر)پیسه‌ئه‌وبه‌نده‌یه‌كه‌ماڵ هه‌ڵئه‌گرێ تابه‌گرانی بیفرۆشێت چونكه‌ خه‌ڵكیش له‌وماڵه‌دا هاوبه‌شن وپێویسته‌ له‌كاتی پێویستی خه‌ڵكا بفرۆشێت، ئه‌گه‌ر به‌پێچه‌وانه‌وه‌ جوڵایه‌وه‌ تاوانباره‌ومیری ئه‌توانێ به‌زۆربه‌نرخی ڕۆژ بفرۆشێت.

شه‌شه‌م/ پێغه‌مبه‌ری مه‌زن( ﷺ)ئه‌فه‌رموێت:( والله لايؤمن... ثلاثاً..الذى يَشبَعُ وجارُهُ جائعٌ )واته‌، به‌خواقه‌سه‌م باوه‌ڕیان نیه‌(سێ جار)ئه‌وانه‌ی كه‌تێرئه‌خۆن وهاوسێكه‌یان برسیانه‌جائه‌گه‌رهاوبه‌ش نین بۆچی وایه‌؟

خوێنه‌ری به‌ڕێز، له‌م باره‌وه‌ ده‌یان ئایه‌تی قورئان وسه‌دان فه‌رموده‌ی تری پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست(ﷺ)هه‌یه‌ كه‌لێره‌دا زیاتر ناگونجێت.

ئیسلام كه‌س بێ منه‌ت ناكات ومنه‌تیش له‌كه‌س قبوول ناكات

ئاینی پیرۆزی ئیسلام دژی كۆكردنه‌وه‌ی ماڵ وعه‌نباركردن ونه‌به‌خشینه‌، دژی كاروكۆشش وپه‌یداكردنی پێ بژیوی نیه‌، چونكه‌ خوای گه‌وره‌ ئه‌م هه‌مووكان وسه‌رچاوانه‌ی كه‌له‌م زه‌ویه‌دایه‌ بۆئێمه‌ی داناوه‌و خۆی ئیحتیاجی به‌ئاڵتون

---

* له‌باسی(ئاڵتون زیو....)مانای ئه‌م فه‌رموده‌ كراوه‌..

وزیوشوشەو ئاسن ومس و.. هتدنیە. کەوابووهەوڵ وکۆشش لەڕێگای دروستەوە بۆوەدەست هێنانی سەروەتی حەلاڵ نەك تاوان نیە، بەڵکو ئەویش بەشێکە لەخواپەرستی(العبادة)چونکەبەشێکە لەیاسای ئیسلام.

ئەنجام دانی هەربەشێکی ئەویاسایەش بەندایەتی خوای گەورەیە، ئەوەتەپێغەمبەری ئیسلام(ﷺ)ئەفەرموێ: گەورەترین چاکە ئەولوقمەخۆراکەیەکەئەیدەن بەهاوسەرەکەتان، خۆخەرجی هاوسەرپێویستە لەسەر پیاوکەچی ئەوخەرجیەیش هەرچاکەوئیحسانەوپاداشتی هەیەلەڕۆژی دوایدا، ئاینی پیرۆزی ئیسلام کاروکۆششی هیچ کەسێك زایە ناکات بەڵکوسوپاسی تێکۆشەران وزەحمەت کێشان ئەکات وڕێزیان بۆدائەنێت، وەهەمووتەلاش وکۆششکی خاوەن باوەڕان بەچاکەئەنوسرێت هەرچاکەیەکیش دەبەرانبەرتاحەوت سەدبەرانبەرتاهەزاروچوارسەدبەرانبەر پاداش ئەدرێتەوە، خوای خاوەن کەرەم وئیحسان ئەفەرموێت(مَنْ جاء بالحَسَنةِ فَلَهُ عَشرُ أمثالِها)واتە، هەرکەسێك چاکەیەك بکات تادەبەرانبەرپاداشتی پیێ ئەدرێتەوە وەهیچ چاکەیەك لەم دەبەرانبەرە کەمترنیە، دیارە ئەگەرچاکەیەك لەڕێگای گەورەترابکرێت، وەك چاکەکردن لەڕێگای بەرزکردنەوەی ئاینە پیرۆزەکەی ئیسلامدا خوای گەورە لەحەوتسەدبەرانبەرەوە تاهەزاروچوارسەدبەرانبەرپاداش ئەداتەوە لەوەیش زیاتری ئەکات بۆکەسانێك کەبەدڵێکی خاوەن ترولەماڵێکی پاکترولەجێگایەکی چاکتراولەکاتێکی پێویست تربدرێت بۆدامەزراندن وبەهێزکردنی ئاینەبەرزوپیرۆزەکەی خوا وەك ئەفەرموێت(مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ)البقرە/261.

واتە، وێنەی ئەوکەسانەی کەماڵیان لەڕێگای خودائەبەخشن وەکودانەوێڵەیەك وایە کەحەوت گوڵ سەوزکات ولەناوهەرگوڵێك داسەد دنك هەبێت وەخوائەمەش دووبەرانبەرئەکاتەوەبۆکەسێك کەبیەوێت وبەڕاستی بەخششەکانی فراوانەوپێشەکی خۆی ئەیان بەخشێ بەخەڵك ولەپاشا لێیان ئەکرێتەوە وەزانایەوچاك ئەزانێ چی ئەبەخشن وچۆن ئەیبەخشن.

خوێنەری بەڕێز، ئاینی پیرۆزی ئیسلام یاساوڕێبازی ئەوزانایەکەخۆمان وکردارەکانمان دروست ئەکات وهەمووشتێك کەپێویستمان بێت لەم زەویەدادایناوەبۆمان پاداشتیشمان پیێ ئەدالەسەرکاروکۆششەڕەواکانمان ودووبارەش پاداشی دەبەرانبەر تاهەزاروچوارسەدبەرانبەروزیاتریشمان پیێ ئەدات لەسەرچاکەکانمان وئەوزاتە کەهەمووئەوچاکەلەگەڵ ئێمەدا دەکات ڕازی نیە کەئێمەلەبەخشین وچاکەدا منەت بخەینەسەرکەس چونکە هەمووئەونیعمەتانەهی خوایەوهەمووچاکەیەکیش پاداش ئەداتەوەولەولایشەوەهەمووئینسانەکان تیاشەریکن بەوشێوەیەی کەلە(موڵکیەتی تاك وزەوی بۆهەمووئینسانە)دابا سمانکرد، کەواتەزۆر ڕەوایەماوەنەدرێت بەخاوەن سامان زیادلەوپاداشەگەورەی

کەخوابۆی داناون منەتێکی تربخاتەسەرکەم دەستان، لەلایەکی ترەوەئەومنەت نانەیان، نیشانەی سپڵەیی ونمەك نەناسی کابرایەوەیان نیشانەی بیٚ ڕەحمی ودڵ ڕەقی یەسەبارەت بەکەم دەستان وبیٚ نەوایان وەیان بەڵگەیەلەسەرهەردوکیان کەئەوانەدووڕەوشتی ناڕەواوناپەسەندن وئیسلام زۆربێزارەلیٚ یان بۆیەئەگەرهەرکەسێك شتێکی بەخشی ومنەتی نایەسەرکابرای پیٚ بەخشراوی یائازاری داچاکەکەی لەناوئەبرێت وهیچ پاداشتێکی لەلای خودانابێت، خوای گەورە لەم بارەوە ئەفەرموێت( يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالأذَى كَالَّذِي يُنْفِقُ مَالَهُ رِئَاءَ النَّاسِ وَلا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الاخِرِ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا لا يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِمَّا كَسَبُوا وَاللَّهُ لايَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ)البقره/264.

واتە، ئەی خاوەن باوەڕان چاکەکانی خۆتان هەڵنەوەشێننەوەبەمنەت نان وئازاردان وەکوئەوکەسەی کەماڵەکەی لەبەر ڕوپامایی ئەبەخشێت وباوەڕی بەخواوبەڕۆژی دوایی نیە، وێنەی ئەوکابرایەو چاکەکەی وەکوبەردێکی ساف وایەوخۆڵێکی ووشکی بەسەرەوە بیٚ ولێزمەبارانێك لێیداوچاك بەردەکە بشۆریٚ وخاکەکەتەفروتونابکات وهیچ کەس نەتوانێت ئەوخاکە کۆکاتەوە(هەرئاوەهائەوانیش)ناتوانن شتێك لەوڕەنج وچاکەی کەکردویانەدەست خۆیان بخەن وچاکەکەیان بیٚ هودە ئەڕوات وهەناسەی ساردی بیٚ نەوایان وچەوساوان ومنەت ئەسەر نراوانی ئازاردراواوگاڵتەپیٚ کراوان ولێزمەفرمێسکی چاوەکانیان ئەوچاکە، ناچاکە، ئەشۆرێتەوە، خاوەن چاکەکەبێجگەلەڕەنجە ڕۆی وشەرمەساری ڕۆژی دوایی هیچی تری بۆنامێنێتەوە وەئەوڕەفتارە ناشیرین وناڕەوایە بەڵگەی کوفری نیعمەت وبیٚ باوەڕیەتی بەخوابۆیە خوای گەورە لەئاخری ئایەتەکەوەئەفەرموێت(والله لايهدى القوم الكافرين)وەخواڕێنمونی گەلی کافران ناکات.

خوێنەری بەڕێز، چاکەی بێباوەڕان وەك درەختێکی تەڕەکەڕیشەکانی ببڕێت ولەجێگایەك دا وەکودرەختێکی نێژراوبکوتێنریٚ بەزەوی دابۆماوەیەکی کەم شێوەی درەختێکی سەوزبوودەداولەپاشا ووشك دەبیٚ وئەتلێتەوەوکەڵکی سەوزی وسێبەری نامێنیٚ جاکردەوەی بێباوەڕانیش هەربەوشێوەیەوبێجگەلەناوی دنیایی کەئەویش لەچاوقیامەتدا وەکوچاوترووکاندنێکیش نیەهیچی تری بۆنامێنیٚ. وەخوایش ستەم لەکەس ناکات، ئەمانەتەنیابۆدنیایان کردووەولەدنیاشدا سوپاس یان ئەکرێت(انّماالاعمالُ بالنيات).

خوای گەورە خاوەنی ئەوهەمووفەڕوخێرەیە، ڕێنماوڕەهبەرانی یەك لەدوای یەکی بۆناردوون وڕێگای خۆشی وخۆشبەختی لەڕێگای گومڕاهی وسەرلیٚ شێواوی بۆجیا کردونەتەوەوداوای لەنمایندەوڕەوانەکراوانی کردووەکەخزمەتی خەڵك بکەن وڕێگای هەمووچاکەیەکیان پیشان بدەن ولەهەمووهەڵەوناڕاەوایيەك دووریان

خەنەوەومنەت نەخەنەسەرخەڵك ویێیان بڵێن(ان أجری الاعلی اللهِ)پاداشم ناویٚ مەگەرلەلای خوا. واتە، ئیسلام نەمنەت ئەنێت ونەمنەت لەکەس قبولٚ ئەکات. بەلآم خاوەنی ئایین: کەخوایە خاوەن دەسەلآتەوهەمووشت هی ئەوەوبیٚ یارمەتی ئەوهیچ شتێك ناکرێت ونابێت زۆربەجیٚ یەکەمنەت بختاتەسەرخەڵك وداوای بەندایەتیان لیٚ بکات چونکەلەڕاستیائەوبەندایەتیەش هەربۆبەرژەوەندی وسودی خەڵکەئەگینا هیچ شتێکی ئێمە سودیان زیان بەخواناگەیەنێت وخوابیٚ نیازەلەخەڵك کەوابوومنەتی خوارەواوشایستەیەومنەتی ئێمە زۆرنارەواونابەجیٚ یەچونکەلەڕاستیا ئێمەخاوەنی گیانمان نین چ جای سەروەت وسامان، بۆیەهەریارمەتی وچاکەیەك منەتی بەدواوە بێت نەکردنی چاکترە( قَولُ مَعروفٌ خیرٌ مِن صَدَقةٍ یَتبَعُهاأذي واللهُ غنيٌّ حَلیمٌ )واتە، قسەیەکی چاك باشترە لەچاکەیەك کەمنەت وئازاردانی بەدواوەبێت وەخوابەحەوسەڵەیەوکەم دەستان نائومێدنەبن وسەروەتمەندانیش بەورەفتارەناپەسەندەی خۆیان وماوەدانی خوابەوان وتۆڵە لیٚ نەسەندنیان بەزویی بالەخۆبایی ودڵخۆش نەبن، وتراوەخوادێرگیرەوسەختگیر،

براوخوشکەهاودین وهاوزوبانەکانم، تەماشاکەن بزانن بێجگە لەئیسلام کام یاساوڕێبازێك وادڵسۆزانەئامۆژگاری خەڵك ئەکات ولەبیری ڕێزوکەرامەتی خەڵکایە؟ کامەیە ئەوپارت وکۆمەلآنەی کەوارەهبەرەکانیان هیچیان لەخەڵك نەوێت ومنەت نەکەن بەسەر خەڵکاجگەلەئیسلام؟

بەخشین و وەرگرتن کەی پەسەندە؟

سەروەت مەندانی خواپەرست وچاکەکاربۆئەوەی چاکەکەیان پەسەندبیٚ وجێگای ڕەزامەندی خوابێت، پێویستەئەم خالآنەی خوارەوە لەبەرچاوبگرن:

1. منەت نەخەنەسەرکەم دەستان.

2. ئازاری چاکەلەگەڵ کراوەکان نەدەن.

3. چاکەکان بەشێوەیەکی نهێنی ئەنجام بدەن بەلآم ئەگەرلەوانەبووکەخەڵکی ترچاوی لیٚ بکات بەئاشکرایی قەیناکا بەڵکو واچاکترە.

4. بەخششەکەشتێکی بەقیمەت بێت لەوانە نەبێت ئەگەر بەخۆیان بدرێت ڕویان نەبیٚ وەری گرن لەبەربیٚ قیمەتی شتەکە.

5. بایارمەتیەکەیان تەنیا لەبەرڕەزامەندی خوابێت وهەرلەوچاوەڕوانی پاداش بکەن.

6. ئەویارمەتیە بەپێویستی سەرشانی خۆیان بزانن وبەلایانەوەگران نەبێت.

7. کەم دەستان وبێ نەوایان بەهاوبەشی سەروەت وسامانی خۆیانیان دانێن وەئەوان بەهۆی زیادبوونی ڕۆزی خۆیان بزانن.

8. لەنزیکترین کەسانی موحتاجی خۆیانەوە دەست پێ بکەن ئینجادورتر.

9. لەماڵ سەرف کردن ویارمەتی دانی بێ نەواياندا لەکەم دەستی نەترسن پێغەمبەری ئازیزمان( ﷺ )سوێندئەخوات وئەفەرموێ: ماڵ بەچاکە کەم ناکاتەوە.

10. باسی چاکەکانیان نەکەن مەگەربۆئامۆژگاری بێت.

ئەی سەروەت مەندی خاوەن باوەڕ، ئەوەیەڕێگای پاك وخاوێن بۆبەخشینەکەت وبەوشێوەیە ئەتوانیت خواوخەڵك لەخۆت ڕازی بکەیت وژیانی ڕۆژی دوایی خۆت لەم ژیانە خۆشتربکەیت، ئەم ژیانەتەنهابۆتاقیکردنەوەیەوهەوڵ دەلەوتاقیکردنەوەداسەرکەویت. جابزانەکە پێغەمبەر( ﷺ )ئەفەرموێت( اللهُمَّ أعطِ مُنفقاًخلَفاً، اللهُمَ أعطِ مُمسكاً تَلفاً ). مانەکەی لەپاشدا دێت پێویستەکەم دەستان وبێ نەوایان ئەم چەندخاڵەی خوارەوەلەبەرچاوبگرن تابەربێ نمەکان نەکەون، چونکە ئیسلام مرۆڤی بێ نمەکی خۆش ناوێ وئەفەرموێت(مّن لّم یّشکُرِالناسّ لّم یّشکُرِالله)واتە، ئەوکەسەی کەسوپاسی خەڵك نەکات ئەوەسوپاسی خوایش ناکات.

1. هەرشتێکیان پێ بدرێت بەکەمی مەزانن چونکەهیچ یارمەتیەك لەزەرە کەمترنیەوخوائەفەرموێت(فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ). هەرکەس بەئەندازەی زەرەیەك چاکەبکات دەی بینێتەوە.

2. دوعاونزای زۆربکات بۆئەوبەخشندەیەوهیچ نەبێت بەدوعای خێرپاداشی بداتەوە.

3. سوودوبەرژەوەندی ئەوبەخشندانە بپارێزن وشتی زۆربە نرخیان لێ وەرنەگرن بەتایبەت ئەگەرزەکات بووبەڵکوشتی مام ناوەندیان وەرگرن لەوشتانەدا کەجیاوازی تیاهەبێت.

4. کاتێ کەپێویستیان نەما ئەبێت زەکات وەرنەگرن ئەگیناتاوان بارن وکابرای زەکات دەریش ئەگەربزانێ بێ نیازن زەکاتەکەیان لەمل ناکەوێ چونە بەجێگای پێویستی نەدراوە.

5. کەم دەستان وبێ نەوایان تائەوجێگایەی کەبۆیان ئەکرێت ئەبێ هەوڵ و تەقەلای بەرزکردنەوەی ڕادەی ژیانی خۆیان بدەن وهەوڵ دەن ئەوانیش لەئایندەیەکی نزیك دا خاوەن بەخشش بن چونکەبەخشندەخێری زۆرتری دەست ئەکەوێت لەلەگیرندە(َالیَدُ العُلیَا خیرُ مِنَ الیَدِ السُّفلي).

6. باسی چاکەی چاکەکاران بکەن وسوپاسیان بکەن.

7. عیزەتی نەفسیان هەبێت وخۆیان لەچاوچنۆکی ودنیاپەرستی بپارێزن وبەتەمای یارمەتی خەڵك نەبن وکاتێ پێیان درا وەریگرن.

8. تائەوجێگایە کەبۆیان ئەلوێت پاداشی چاکەکاران بدەنەوە.

براوخوشکەکانی سەروەتمەندوکەم دەستان وبێ نەوایانی خۆشەویست ئەگەرهەردوولا ئەومەرجانەی کەباسمان کرد لەبەرچاویان گرن بەڕاستی بەخۆشی وخۆشبەختی ئەژیت وسێبەری برایەتی و یەکێتی ویەکسانی هەمووگەل داگیرئەکات وهەموزەلامێکی ئەوگەلەلەفێنکی ئەوسێبەرەدابەجوانی ئەحەسێتەوەولەئێش وژانەکانی دنیا فرە ئارام ئەگرێت وئەتوانن نموونەیەك بن بۆگەلانی تری جیهان ومامۆستایەك بن وەکوجاری جاران بۆخەڵك وبەورەفتارە بەنرخانەتان جیهانی سێیەم وبێ دادگەری وملهوڕی ودیکتاتۆری ڕۆشن کەنەوەوسەدان گەلی بێ نەواو ژێر دەست وستەم لێکراوی تر لەئێوەدەرس وەرگرن بەڵام ئەگەر هەروەکوئەمڕۆوابن ئەبێ هەمیشە ژێر چەپۆك وکۆڵ هەڵگروبارکێش بن بۆهەمووستەمکاران و ملهوڕان ولەخوا بێ خەبەران، زۆر جێگای داخە لەم چەرخەدا کەچەرخی زانینەگەلی بەتەسکەرە مسوڵمانی ئێمە هێشتاسەر لەهیچ دەرناکات وبەهەموبایەك خەرمانی خۆی شەن ئەکات بێ ئەوەبیرلەئامانج وپاشەڕۆژی خۆی بکاتەوە.

لەبەرڕژدی زۆرنیە

خوای گەورە دروستکەری مرۆڤ وهەست وخواستەکانیەتی ومرۆڤ چاك ئەناسێت و هەمووئاشکراو پەنهانیەکانی مرۆڤی لەلازۆر ڕونەئەگەرخۆشەویستی ماڵی لەناودڵدا دانەئەنامرۆڤ بەتەمەڵی پاڵی لێ ئەدایەوەوزەویش ئاوەدان نەئەکرایەوە، ئەوهەموونیعمەتە گەورە ولەژمارەنەهاتوی خوایش نەئەناسران وسودیان لێ وەرنەئەگیرا وگەلێکیان بێ کەڵك ئەمایەوە، ئاشکرایە خوای گەورە زەوی بۆمرۆڤ دروستکردوەوپێویستە لەسەری کەئاوەدانی کاتەوە، کەواتەپەروەردگاریش بۆتەواوکردنی نیعمەتەکانی بەسەرمرۆڤ دا ووزەوئەسبابی سودلێ وەرگرتنی پێداوەوخۆشەویستی گەلێك شتی لەناودڵیا ڕواندوویەکێك لەوانە ماڵ ویستنە قورئان ئەوڕاستیەمان بۆڕوون ئەکاتەوەوئەفەرموێت: ( زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ذَلِكَ مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الْمَآبِ)ال عمران: 14، واتە: جوانکراوەبۆمرۆڤ خۆشەویستی ئارەزوەکان لەژنان وکوڕان وکۆمەڵەسەروەتی زۆری ئاڵتون وزیووئەسپی تالیمی وچوارپێ یان(مەڕوبزنووشتروگاو)کێڵگە، ئەمانەکەل وپەلی ژیانی دنیان وەلەلای خوایەلەڕۆژی قیامەتا جوانترین وشیرینترین جێگا. لەم ئایەتە پیرۆزەوە بۆمان دەرکەوت کەئیسلام سەرکوتی ئارەزوەکان ناکات بەڵکوبەپێچەوانەوە ئارەزووەکان

تیژئەکاتەوەو هەڵیان ئەنێت کەهەریەکەیان بەشی خۆی لەڕێگای خۆیەوە پەیدابکات وبەکاری بهێنێ، دەی

ئاشکرایەکەخوای خاوەن دەسەلاَت وزاناوئاگاداره بەسەرئەوەدا ئەگەرئیجازەی بێ سنوور بەهەرلایەنێك بەلایەنەکانی

مرۆڤ بدرێت، نەك دنیائاوەدان ناکرێتەوە بەڵکو لەبەین ئەبرێ و وێران ئەکرێت، بۆیە زانای کاربەجێ بۆهەموو

ئارەزوخواستەکانی مرۆڤ یاسایەکی تایبەتی بۆداناوەوسنووری بۆدیاری کردوەوڕازی نیە لەوسنورە لاداوسەرلەخۆی

وخەڵکیش تێك بدات چونکە ئەودروستکەرەودروستکراوی خۆی چاك ئەناسێت. بۆنموونە، خۆشەویستی ماڵ لەدڵی

مرۆڤدا ناسرێتەوەوماوەیشی پێ نادات کەبەئارەزەی خۆی چی ویست وابکاوهەمووسودەکانی ڕواڵەتی خۆی بێ

لەبەرچاوگرتنی زیانی ئەم وئەودابین بکات، بەڵکوڕێگای پەیداکردنی بۆدیاری کردوەونابێ لەوڕێگایەبترازێت

وەماوەی داوە کەخاوەنی ماڵ بێت بەومەرجانەی کەلەپێشەوە باسمان کردوئەڵێ خەرج بکەبەومەرجەنەگاتە هەڵە

خەرجی وزیادەڕەوی( وَكُلُوا وَاشْرَبُوا وَلا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ )الاعراف/ 31، واته: بخۆن وبخۆنەوەوزیادەڕەوی

مەکەن بەڕاستی خودا زیادڕەوانی خۆش ناوێت، هەروەهاماوەی ماڵکۆکردنەوەی پێداوەبەلاَم چی وتاچەندێك و بێ

سنورەنیە(ئەمانە هەمویان لەباسەکانی پێشوودارون کراونەتەوە، جارێکی ترسەرلەوباسانەبدەوسنورەکانیانبناسە).

براوخوشکی مسوڵمان، ئاینی مرۆڤ پەروەری ئیسلام یاسای خوای زاناو کاربەجێ یەوهەموبڕیارەکانی

لەسەربناغەی ژیری ومرۆڤ دۆستی وبۆسودوبەرژەوەندی هەمووئینسانەکان دانراوە نەك بۆچینێك یاگەلێك یازبان

وڕەنگێك، وەکولەباسی زەوی بۆهەمووئینسانەدا باسمان کرد ئاینی پیرۆزی ئیسلام دژی کۆکردنەوەوعەنبارکردنی

ماڵەوبێزارە لەوڕەفتارە ناپەسەندو بێ بەزەییانەو هەڕەشەی سزاو ئاگری جەهەنەمی لێ کردون وەلەچەند

بارودۆخێکی تایبەتی دا نەبێت وەکونەدانی زەکات یائیحتیاجی زۆری خەڵك ومیری نەتوانێت بەسەریانا بگات

وچەندوێنەی ترکەلەپەڕاوە فیقهیەگەورەکاندا بەدرێژی باس کراون بەزۆرماڵی سەروەت مەندان هەموویابەشێکی

بەسودی گشتی وەرناگیرێت وخوداخۆی ئەزانێ لەناوئەودروست کراوەی خۆیداولەبەرڕەزامەندی خواوسودی خەڵك

فیدای ئەکات وچاولەهەمووخۆشی وخۆشگوزەرانێکی خۆی ئەپۆشێ وچی لەتوانا بێت کۆتایی ناکات، چونکەخۆی

وسامانەکەیشی بەهی خوائەزانێ ولەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەرلەخوائەترسێت(وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ أَنَّهُمْ إِلَى

رَبِّهِمْ رَاجِعُونَ)المؤمنون/60.

واته، ئەوانەی کەهەمووئیشێکی چاك ئەکەن وهێشتا دڵیان ئەترسێت چونکەئەزانن دووباره ئەگەڕێنەوە بۆلای

خواوحیسابی هەمووشتێکیان لەگەڵ ئەکرێت، کەمی واهەیە ئابەوشێوە ڕەفتاربکەن و(ئەبوبەکر)ئاسایی بکەونەماڵی

خۆیان وبەچەپ وبەڕاستا لەڕێگای ئاین ورزگاری چەوساواندا بلاَوبکاتەوە خوای گەورەودادگەر ئەزانێ کەزۆربەی

هەرە زۆری بەندەکانی بەوشێوە ڕەفتارناکەن ولەکۆکردنەوەودانانی لەسەریەك زۆرسورن وئامادەنین لەسودی گشتی داخەرجی بکەن بۆیەئەفەرمویێت(  إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى )اللیل/ 4، واتە: بەڕاستی کۆششی ئێوەچەندەهاجۆرە، هەندێك ئامادەیە ماڵ وگیانی لەڕێگای خوادافیدای بکات وهەندێك دژی خواو ئایین خۆی لەناوئەدا هەندێك ئەگەرئیشی چاکیان بۆهەوڵ نەکەوێ ژیانیان پێ خەسارەوهەندێك ئەگەرداوای چاکەیان لێ بکرێت پێ یان خەسارە، هەندێك بۆبەرژەوەندی خەڵك گیان وماڵ دائەنێن وهوندێك بۆسودی خۆیان هەزاران گیان وماڵ لەناوئەبەن بەڕاستی(  إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى).

خوێنەری بەڕێز، خوای میهرەبانوخاوەن نیعمەت ئەوەندە بەلوتفەتاقیکردنەوەی مرۆڤ تا پلەیەك ئەباوزۆرتەنگ بەمرۆڤ هەڵناچنێ چونکە خوانایەوێ خەڵك لەیاساکەی لاداوتاقیکردنەوەی تەنیا بۆپاڵفتەکردنی دۆستەکانیەتی تانەیەڵێ مرۆڤی گەندەڵ وناپاك لەوریزەدا خۆیان بشارنەوە، تەنانەت ئەوەندەتەنگی ناکات هێشتا هەندێ مرۆڤی گەندەڵی پشووردرێژی لەناودائەمێنێتەوە، ئەوەتەوڕەیی خۆی لەعەنبارکردن دەرئەبڕێ وبەڵێنی سزای ڕۆژی قیامەتی یان پێ ئەدا ئەگەربەوڕەفتارە ناپەسەندەدرێژە بدەن، بەڵام زۆریان لێ ناکات بۆکەم کردنەوەی سەروەتەکانیان چونکەچاك دروستکراوی خۆی ئەناسێ و ئەزانێ ئەگەرزۆری لێ بکات لەژێر بار  لائەچێت وگوێ بەیاسای ئیسلام نادات وخۆی دوچاری سەرگەردانی وماڵ وێرانی دنیاوقیامەت ئەکات ئەگینا ئیسلام هیچ کات لەگەڵ سەرمایەداریدا دانوی ناکوڵێت، جابائەوانەی کەخۆیان بەمسوڵمان ئەزانن وهەمیشە خەریکی ماڵ کۆکردنەوەو عەنبارکردنن باتەماشای ئەم ئایەتە پیرۆزانە بکەن کەخوائەفەرمویێت: ( إِنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَإِنْ تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْأَلْكُمْ أَمْوَالَكُمْ (36) إِنْ يَسْأَلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا وَيُخْرِجْ أَضْغَانَكُمْ (37) هَاأَنْتُمْ هَؤُلَاءِ تُدْعَوْنَ لِتُنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَمِنْكُمْ مَنْ يَبْخَلُ وَمَنْ يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَنْ نَفْسِهِ وَاللَّهُ الْغَنِيُّ وَأَنْتُمُ الْفُقَرَاءُ وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ (38) ) محمد/36-38.

براوخوشکە مسوڵمانەکان بابەرلەوەی مانای ئەم ئایەتانەبکەین بابزانین ئەم ئایەتانە کەی هاتنە خوارو ڕویان لەچ کەسانێکەولەکێ تورەن، ئەم ئایەتە پیرۆزانە لەشاری مەدینەدا هاتنەخوارورویان لەومسوڵمانانەکرد کەنیوەی ماڵەکەی خۆیان دابوویەکۆچەریەکانی مەککەوتەنانەت هی وایان هەبووکەخاوەنی دووژن بووبەهاوڕێ کۆچەریەکەی ئەوت: (تەماشای ژنەکانی من بکەکامیانت ئەوێ تامن تەلاقی بدەم بۆت)ئاشکرایەهاوەڵەکۆچەرییەکان و شاگردانی یەکەم قوتابخانەی  پێغەمبەرخاوەنی چەندین نەریت وخوی پەسەندبون وبۆخۆشی وڕابواردن وئاسودەیی خۆیان ماوەیان بەخۆیان نەئەدا کەئەوشتە بەنرخانە لەبرا موسڵمانەیارمەتی دەرەکانیان وەرگرن. ئەم ئایەتە پیرۆزانە ڕوئەکەنە ئەومسوڵمانانەوئەفەرموێت: ژیانی دنیا ئەوەندە گرنگ نیەکەئێوە ئەوسەروەت وسامانە زۆرەی بۆکۆئەکەنەوەوژیانی

دنیا گاڵتەوگەمەیەکەوزیاترنیەوکۆتایی پێ دێت، ئەگەرباوەڕبهێنن وخۆتان لەڕق وتوڕەیی خوابپارێزن، خواپاداشتان ئەداتەوە وخوا داوای ماڵتان لێ ناکات وماڵی ئێوەی ناوێ وبێ نیازە لەماڵەکانتان، ئەگەرداواتان لێ بکات وزۆرتان لێ بکات ڕژدی ئەکەن ورق وقینی ناودڵی خۆتان سەبارەت بەئایین ئاشکرا ئەکەن چونکەئەوەندەماڵتان خۆش ئەوێ وهەوڵی کۆکردنەوەوعەنبارکردنی ئەدەن ئەگەرداوای بەخشینی ماڵتان لێ بکرێ ولەوبارەوەزۆرتان لێ بکرێت لەژێر باردەرئەچن وگوێ بەیاسای ئیسلام نادەن، – بەڵام نەئەبوو وابن ئەوەبوو ئێوە بانگ کران بۆئەوەی ماڵ سەرف بکەن لەڕێگای خوادا، هەندێکتان ڕژدی تان کرد، هەرکەسێ ڕژدی بکات زیانی بەخۆی گەیاندوە، وەخوا بێ نیازەو ئێوە موحتاجن، وەئەگەرلەئایین پاشگەزئەبنەوەخوائێوەی ناوێ وگەلێکی تردێنێتە سەرکارکەئەوان وەکوئێوەنەبن.

بەڵکوئەوان خاوەن باوەڕو لەخواترس وماڵ سەرف کەربن لەڕێگای بەرزوبەهێزکردنی ڕێبازەکەی خوداودوربن لەڕژدی وبەخیلی، هەروەها قورئان ڕووبەوبەومسوڵمانانە ئەکات وئەفەرموێت: (وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)البقره/195، واتە، لەخەیاڵی ماڵ کۆکردنەوەوسەروەت وسامان نانەوەیەکدا نەبن بەڵکو ماڵ سەرف بکەن لەڕێکای خوداو بەخیلی وڕژدی نەکەن وبەدەستی خۆتان خۆتان نەخەنەتەنگ وچەڵەمەی قیامەت وژیانی دنیاوە چونکەجیهادو تێکۆشان لەڕێگای بڵاوکردنەوەی ئایین ودامەزراندنی پێویستی بەماڵ هەیە، ئەگەرماڵ سەرف نەکرێت لەڕێگای ئاییندا ئەوەئاینەکەتان بۆسەقامگیرنابێت ولەدنیادالەونیعمەتەگەورەبێ بەش ئەبن ولەڕۆژی دواییشداووچاری سزای سەخت ئەبن کەوابووخۆتان نەخەنەناوئەوئێش وئازارەوە بەهۆی ڕژدیتانەوە، چاکەبکەن، چاکەبەڕاستی خواچاکەکارانی خۆش ئەوێت. لەم ئایەتەپیرۆزەدا دەرکەوت کەخۆگرتنەوە لەسەرف کردنی ماڵ لەڕێگای خواداو عەنبارکردنی سەروەت وسامان وگوێ نەدان بەئایین نەك خۆشبەختی ناهێنێت بەڵکو بەپێچەوانەوەشەرمەندەیی وسەرشۆڕی هەردووجیهانی بەدواوەیە.

براوخوشکەمسوڵمانەکان، هیوادارین بەچاکی ئاینەپیرۆزەکەی خۆتان بناسن وئەرکی سەرشانی خۆتان سەبارەت بەوئاینەئەنجام بدەن چونکە ناسینی بێ کردەوە، هیچ دەردێك دەوا ناکات وەکو ئەوەوایە کابرایەك سەری ئێش وبکات وبزانێ کەئەسپرین باشە بۆسەرئێشەوهەربڵێ ئەسپرین باشە. ئەسپرین باشە، ئایاچاك ئەبێتەوە؟ بەڵام ئەگەربێ دەنگ ئەسپرینەکە بخوات سودی لێ وەرناگرێت؟ واتەکردارمەرجی ڕاستی بیروڕایە نەقسەی ڕوت، جائەگەرلەئیسلام دا سەروەت وسامانی عەنبارکراو بەزۆرلەخاوەنەکەی نەسەنراوە لەبەرئەوەنەبوە کەئیسلام بەوعەنبارکردنە ڕازی بوبێت بەڵکولەبەرئەوسیفەتەیە کەکەم کەس ئەتوانێ بەسەریازاڵ بێت، ئەگەرزۆربخرێتەکار سەرمایەداران لەباتی سوپاسی نیعمەتەکانی خواویارمەتی ئاینە پیرۆزەکەی ئیسلام بدەن زۆربەیان ئەبن

بەسەدلەرێگای بلاوكردنەوەی ئایین داوبەومالّ وسەروەتەیان هەزاران كەم دەست وبیّ نەوائەخەلّەتیّنن وئەیان كەن بەدارودەستی خۆیان وپارێزگاری سامانەكانی خۆیانیان پیّ ئەكەن كەحەزرەتی عومەر(ڕەزای خوای لیّ بیّ)یەكەم قوربانی ئەم بەرنامە ڕاستەبۆبەدەست شازادەومالّ پەرستانی ئەوسەردەمەچونكەیەكەم كەس بووكەهەولّی دا ئەم بەرنامەیەبەشێوەیەكی گشتی بەرێوەببات. * كوردواتەنی(لەعاقلان ئیشارەتێك).

براوخوشكەمسولّمانەكان تەماشایەكی ئەومسولّمانەبكەن كەئەوچەندئایەتە پیرۆزانە رویان لیّ كردون وتوڕەیە لەسەرهەلّوێستی هەندێكیان سەبارەت بەئایین وبەرنامەی ئابوری. جائینجا ئەزانی كەئەمرۆئێمەلەچ قۆناغێكداین ئایاڕەوایە خۆمان بەمسولّمان ناوببەین؟ ئەمڕۆهەمووسەروەتمەندانمان بەوسامانەی كەخواپیّ ی داون سەرخۆشن وبێجگەلەخۆیان كەس نابینن وبێجگەلەبەرژەوەندی خۆیان

بەرژەوەندی هیچ كەسێكی تریان لەبەرچاونیە، بەلّكو بەدووكۆشك وچەندین سەیارەوهەزاران دینار هەرتێرنابن هەمیشە خەریكی سوێندی درۆخواردن وفێلّ وفرن تابتوانن شتێكی تری لیّ زیاد كەن وئەگەریارمەتیەكیان لیّ داواكرێت یاهەرخۆیانی لیّ كەرئەكەن

وەیابەشێوەیەكی وائەویارمەتیە ئەدەن كەگیرندە بێجگەلەشەرمەزاری هیچی تری دەست ناكەوێت، ئەگەرئامۆژگاریش بكرێن قاروون ئاسایی ئەلّێت(قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِنْدِي أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِنْ قَبْلِهِ مِنَ الْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا وَلا يُسْأَلُ عَنْ ذُنُوبِهِمُ الْمُجْرِمُونَ)القصص/78.

واتە، بێجگەلەزانیاری خۆم هیچ شتێك ئەومالّەی بەمن نەداوەومنەتی كەسم بەسەرەوە نی یە، ئایاهەرئاوەها بیرئەكاتەوە؟ ئایانازانێت خوالەپێش ئەوداچەندین گەلی لەوبەهێزتروسامان زۆرتری لەناوبردووە؟ تاوان باران ئەوەندە ناسراوودیارین بەرەوسزای جەهەنەم بەریّ ئەكرێن وپرسیاری تاوانەكانیان تازەلیّ ناكرێت.

ساماندارانی ئەمڕۆی ئێمە بەدەیان كۆشك وسەیارەوموغازەی گەورە هەرنالّێن بەسەولەگەلّ ئەوەشدا لەملولایانەوەچەندین براوخوشكی مسولّمانی خۆیان ئەبینن كەبەنانی شەویّ موحتاجن زۆرجاردوكەلّی هەناسەی هەناوی لەبرسا سوتاویان تێكەلاّوی دووكەلّی گۆشتی برژاوی ئەوان ئەبێت وجارێكیش نەیان توانی ئەودوكەلّەلەیەك جیاكەنەوەوئاوڕێك بەلای ئەوانیشا بدەنەوەوقازانجی چەندرۆژێكی تەمەنیان پێشكەش بەوبراوخوشكەبیّ نەواوكەم دەستانەیان بكەن وەلەباتی یارمەتی دانیان كۆشكەكانیان مالّە بچكۆلەكانی ئەوانیان بیّ پەردەكردووەو ڕێگای هەوای پاكیشیان لیّ گرتوون!! لەهەمووسەیرترئەوەیە كەلافی برایەتی ویەكێتی لیّ ئەدەن!!برا، ئەگەربرایەتی وابیّ ئەی

---

* هەمان كردار پێغەمبەری مەون(ﷺ) لەكاتی هاتنی بۆمەدینەدا لەناوئەوكۆمەلّە پاك وخاوێنەدا ئەنجامی دابەلاّم لەبەركەمی مانەوەی پێغەمبەروپەیدابونی نۆمسولّمان ئەوبەرنامەیەلەوكۆمەلّە زیاتر تیّ نەپەڕیوەو ئەوبڕیارەی حەزرەتی عومەردرێژەدان بوبەوسیاسەتەبەلاّم ناكام كرابەپیلانێكی سیّ قۆلّی(ئاگرپەرس وجولەكەومنافقەكان)

دوژمنایەتی چۆنە؟ برائیسلام بەپرچ وریش ومێزەرەی مەلاوشاڵی مام حاجی وتەزبیحی سەدانەوریزی ئەوەڵی جەماعەت و وورتە وورتی لێوان نیە، ئیسلام کردەوەیە، کردەوە، وەك پێغەمبەرمان( ﷺ )ئەفەرموێت(ان الله لاینظُرُ الي صُوَرِكُم وأجسادكُم ولكن يَنظُرُ الى قُلُوبِكُم وأعمالِكُم) واتەخوا تەماشای وێنەولەشتان ناکات بەڵکوتەماشای دڵەکانتان وکردەوەکانتان ئەکات. ئەی خاوەن سەروەتان چاك بزانن لادانی زۆربەی بیٚ نەوایان وکەم دەستان لەئایین ونەبون، یاکەمی تێکۆشەرانی ڕاستەقینەی ئیسلام هۆی زۆرگرنگی ئێوەن بەوڕەفتارەتان برام بۆئەترسیت لەسەرفکردنی سەروەتەکەت؟ مەگەرنازانی خوابەڵێنی داوەکەجێگای خاڵی پڕبکاتەوە ( بنی ادَمَ أنفق أُنفق عَليك )ئەی کوڕانی ئادەم ببەخشن تاببەخشریٚ پێتان. هەروەهافریشتەکان هەمووبەیانیەك دوعای خێربۆبەخشندەکان ئەکەن ونزای شەڕ لەڕژدی وبەخیلەکان ئەکەن وئەڵێن( اللّهم أعط مُنفِقا خَلفاً اللّهم اعط مَمسِكا تَلفاً ) خوایە ببەخشەبەوانەی کەئەبەخشن وبفەوتێنەماڵی ئەوانەی کەنابەخشن.ئەی خاوەن باوەڕان ئەوسەروەت وسامانەکەخوا بەئێوەی داوەئەگەربەدڵێکی خاوێنەوەوبەبیروڕایەکی ڕاستەوەببەخشن سودێکی زۆرگەورە وگرنگتان دەست ئەکەوێت و خوالەتاوانەکانتان خۆش ئەبێت(إِنْ تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ)التغابن/17.

واتە، ئەگەرئێوەقەرزی جوان بدەن بەخوا، خوائەوچاکەیەزل ئەکات ولەتاوانەکانتان چاوپۆشی ئەکاوبەڕاستی خوا سوپاسی چاکەکاران ئەکات وبەحەوسەڵەیە. واتە ئەگەرزۆرپاداشتان نەدی نائومێد نەبن ودڵنیابن کەخوا ڕێزتان لیٚ ئەگریٚ وچاکەی ئێوەی لەبیرناچێت وچاوەڕوانی لەمرۆڤیش ئەکات کەخۆگروبەحەوسەڵەبن.

خوێنەری بەڕێز، جاتەماشای بەخشندەیی وکەرەمی خوای گەورەوزانابکە، ئەوهەموونیعمەتانە کەخوابەمرۆڤی داوە هەرلەلەش وچاووتەمەن وژیری وەبگرەتاسەروەت وسامان هی خۆیەتی وبەئەمانەت بەمرۆڤی بەخشیون و ئەفەرمویٚ : سەرفی بکە تابیروباوەڕەکەت بەسەلامەتی بمێنێتەوە سەرفی بکە تامن سوپاست بکەم، سەرفی بکە تابەڵگەبێت لەسەرسوپاسی تۆبۆمن. من کەهەمووئەونیعمەتانەم بەتۆداوەکەچی تۆلاساری ونالەباری پیٚ ئەکەیت، من هێشتاهەرخۆئەگرم تاکاتی دیاری وبەحەوسەڵەم تابەڵکوپێش هاتنی کاتی دیاری لەوڕەفتارانەی خۆت پەشیمان ببیتەوەولەڕێگای خواپەرستی وخزمەت بەخەڵکی خواداهەنگاوهەڵگریت وخواوخەڵکت لەخۆت ڕازی کەیت، زۆرکەس بوون لەپێش بوندا بەڵێنیان ئەداوسوێندیان ئەخواردئەگەربێت وخواماڵیان پیٚ بدا زۆربەچاکی لەوماڵە ئیش ئەکەن ولەهیچ چاکەیەك کۆتایی ناکەن بەڵام کاتیٚ خواسەروەتی بەسەرداڕژادن بەڵێن وسوێندەکانی خۆیان نەبردەسەرو چونەڕیزی دووڕووەکانەوە(وَمِنْهُمْ مَنْ عَاهَدَ اللَّهَ لَئِنْ آتَانَا مِنْ فَضْلِهِ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ الصَّالِحِينَ ( 75) فَلَمَّا آتَاهُمْ مِنْ فَضْلِهِ بَخِلُوا بِهِ وَتَوَلَّوْا وَهُمْ مُعْرِضُونَ (76) فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِي قُلُوبِهِمْ إِلَى يَوْمِ يَلْقَوْنَهُ بِمَا أَخْلَفُوا اللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ ( 77) أَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُمْ وَأَنَّ اللَّهَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ) توبە،75-78.

واتەلەناومسوڵماناندا هەندێك هەبووون کەپەیمانیان بەخوادائەداوئەیان وت ئەگەربێت وخوالەنیعمەتەکانی خۆی بڕژێنێت بەسەرماننداو دەوڵەمەندمان بکات ئێمەیش پیاوی چاك ئەبین، بەڵام وەختێك خوادەوڵەمەندی کردن پەیمانەکانی خۆیان شکاند وڕژدوڕەزیل بوون ولەیاسای ئیسلام پاشگەزبونەوەجالەبەرئەوبیٚ وەفایی وڕژدەی وئەودرۆیانەی کە کردیان دوودڵی ودڵەڕاوکیٚ بووبەبەشیان تائەوڕۆژەی ئەگەنەخزمەتی خوا، ئایانازانن کەخوانهێنی وچەی ئەوان ئەزانێت؟؟ وەبەڕاستی خوازانەری نهێنیەکانە- هیواداریین کەبرامسوڵمانەکانمان ئاوڕێك لەخۆیان بدەن ونەچنەئەوریزەوە(اللهم ربنا اتنا في الدنيا حَسَنةً وفي الاخرة حَسَنة وقنا عَابَ النَّار)امین.

***باوەڕ گرنگترین پاسەوانی ئابووریە***

سەرچاوەی هەمووژیریەك وبەردی بناغەی هەمووخۆش بەختیەك ترسان لەخوایە، ئەوکەسەی کەباوەڕی بەخوای خاوەن دەسەڵات وزاناودانا هەبێت و بزانیٚ کەڕۆژیٚ دێت کەلەبەردەم خوادا هەمووکردارەکانی ئەخرێتەڕووهیچ ون نابێت مەگەرخواخۆی چاوپۆشی لیٚ بکات ناتوانێت لەیاسای ئەوزاتەلادات، لادات باکەسیشی لەگەڵانەبیٚ ولەشەوێکی

زۆرتاریکیشابێت، چونکەئەزانێ ئەوزاتەنەك تەنیا ئاگای لێ یەتی بەڵکو ختورەکانی ناوی دڵی ئەودروستیان ئەکات ئیتر چۆن دەتوانێت خۆی یان کردارەکانی لەوزاتەبشارێتەوە؟ وەیادژی یاساکەی ئەو ڕەفتاربکات؟ واتەئیسلام سەرەڕای یاسای تۆڵەوسزای دنیابۆتاوانباران لەوباوەڕەدایە کەئەویاسایەبەتەنیایی ناتوانێت خەڵکی لەتاوان و ڕەوشتی ناپەسەندبگێڕێتەوە لەم بارەوەئەوەندەشتەکەڕونەهیچ پێویست بەبەڵگەناکات، تەنها یەك ڕۆژ گۆڤارو ڕۆژنامەکانی جیهان تەماشاکەیت وسەرنجێ لەتاوانەکان بدەیت لەگەڵ ئەوهەموویاسای گەورە وگرانانەی دەستکردی مرۆڤ وئەوهەمووچاودێری کەرپۆلیسانەدابۆت ئاشکرا ئەبێت کەلێدان وزیندان وتۆڵەسەندنەوەی ڕووت وبەرگری توندوتیژ ناتوانێت بەتەواوی ئەمن وئاسایش بۆخەڵکی دەستەبەرکات ورێگای تاوانەکان بگرێ، ئەوتاقانەرێبازەی کەهەمووکەس وەکویەك تەماشاکات وکەس لەدەستی دەرنەچێت و نەپاداش ونەتۆڵەی کەسی لەبیرنەچێتەوە تەنیارێبازی ئیسلامە وبەس(بۆزیاتر شارەزابوون لەم بارەوە تەماشای نامیلکەی(کێ یاسامان بۆدانی؟) بکە.

چونکە ئیسلام بناغەکەی لەسەربیروباوەڕ بەخوای گەورەوخاوەن دەسەڵات دانراوە، ئەوخوایەی کەهیچی لێ ون نابێت نەگەورەونەبچوك نەوتەونەکردارونە ئاشکراو نەنهێنی( عَالِمِ الْغَيْبِ لا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَوَاتِ وَلا فِي الآرْضِ وَلا أَصْغَرُ مِنْ ذَلِكَ وَلا أَكْبَرُ إِلا فِي كِتَابٍ مُبِينٍ)سبأ/3

واتە، خوا زانەری هەموشتەشاراوەکانەوبەئەندازەی زەڕەیەکوبچوکترلەزەڕەوگەورەترلەزەڕەی لەناوئاسمانان ولەناوزەویدا لێ ون نابێت وچیچ شتێکی لێ حەشارنادرێت مەگەرلەپەڕاوی ڕون کەرەوەی ڕاست وناڕاستدا تۆمارکرابێت ئاشکرایەئەوکەسەی کەباوەڕی ئاوای بەوزاتەخاوەن دەسەڵاتەهەبێ وباوەڕی بەڕۆژی قیامەت وپاداشت وسزای ئەوڕۆژە نەبڕاوە هەبێت نەك خۆی تاوان ناکات بەڵکوئەگەرزۆریشی لێ بکرێت تائەوجێگایە کەئیختیاری لەدەست خۆیدا هەبێت هەرتاوان ناکات. چونکەئەزانێ هەرهێزودەسەڵاتێ زۆرلەوبکات هەرکەس وهەرچۆن ببێت هێشتا لەبەردەم هێزوتوانایی خوادا هەرلاوازوبێ دەسەڵاتە وەئەگەرخاوەنی هێزودەسەڵاتیش بێت ئەزانێ کەئەوهێزودەسەڵاتەی ئەمانەتن وهەروەخت خوائارەزوی لێ بێت خۆیش ودەسەڵاتەکەیشی ئەباتەوە، ئیترهیچ کات خۆی لێ بایی نابێت ولەهەرپلەومەقامێکی بەرزو لەهەرجێگایەکدا هەبێت نەك دژایەتی ئایین ناکات بەڵکو بەپێچەوانەوە ئەوهێزودەسەڵاتەی خۆی لەخزمەت ئایین ڕێبازە ئاشتی خوازەکەی ئیسلامدا بەکارئەهێنێ لەبەرئەوپلەومەقامەی کە بەئەمانەت داویەنی پێ ی وزیاترهەست بەبەرپرسی ئەکاو زیاتر هەوڵ ئەدات خوالەخۆی ڕازی کات وەئەگەردووچاری هەڵەوتاوانێکیش بێ هەوڵ دەدات بەکردارێکی باش وبەندایەتی دڵسۆزانەو بێ خەوش وخاڵ بیسرێتەوە چونکە ئەزانێ پەروەردگاری زۆرمیهرەبان وبەخشندەیەو فەرمویەتی( إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ)هود/114، بەڕاستی چاکەکان خراپەکان لائەبەن.

جا، ئەوانەی کەخۆیان ڕژدوڕەزیل بن بەچ ڕوییەکەوە داوای بەخشش لەخوا ئەکەن؟!! خوێنەری بەڕێز، سزاو تۆڵەی ڕۆژی دوایی ودەرنەچون لەژێردەستی خوداوسزای ڕۆژانی هەرگیز دوانەهات وئەبێتە هۆی گەڕانەوەی مرۆڤ لەتاوان واتە، لەکڕین وفرۆشتن دا ئەوەی کەمایەی ناڕەزایی خوابێت، ئەنجامی نادات وەلەبەخشین ومالْ سەرف کردنیشاهەروائەبێت ئاشکرایەکەخاوەن باوەڕی وانەسوخۆرە نەخیانەت کارە نەفێڵ بازە نەقازانج وسودی خۆی پێش قازانج وسودی خەڵك ئەخات، نەماڵ بەشێوەی ناڕەوا وەکوقوماروشەراب وتلیاك وجگەرەوباقی شتەحەرامەکانی ترسەرف ئەکات ونەهەڵە خەرج ئەبێت وەنەڕژدوبەخیل وپیسکە نەماڵ بەهەردم سەرف ئەکات ونەبەندەی ماڵ وعەنبارکەرئەبێت، جائەگەرهەمووگەلان وابێت چی هەیە لەوەچاکتربێت؟ بەڕاستی ئەوانەی کەخوابەچاکی ئەناسن وئەزانن کەهەمیشە لەگەڵیاندایەو بەچاوتروکاندن لێیان بێ ئاگانابێ(وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَمَا كُنتُمْ)الحديد/4، ناتوانن بەدەستی ئەنقەست تاوان بکەن ودرێژەی پێ بدەن واتە، باوەڕبەخواو بەڕۆژی دوایی گەورەترین هاندەروپاڵنەری مرۆڤەبۆچاکەکردن وهیچ چاکەیەك بەکەم نازانێ ودەستی بەسەرهەرچاکەیەکدا گەیشت نایبوێرێت، هەرلەلابردنی دڕکێك لەسەر ڕێگادا هەتابەش کردنی ماڵەکەی لەگەڵ خەڵکاودڵنیایە کەئیشەکانی بەزایەناچێت وپاداشتی

هەمووچاکەکانی وەرئەگرێتەوە(وَمَا يَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ يُكْفَرُوهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ ) ال عمران/115،واتە، هیچ چاکەیەکتان پێ شێل ناکرێت وەخوائەزانێ کامانە لەخوا ئەترسن وهیچی لێ پەنهان نابێ.

بەڵێ، خاوەن باوەڕی ڕاست بەهۆی ئەوبیروباوەڕەوەئارام ئارام هەنگاوەکانی هەڵئەگرێ وئەوەی لەتوانای دابێت لەئیشی چاك وخزمەت بەخەڵك کۆتایی ناکات وئەڵێ(رَبَّنَا وَلا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلا تُحَمِّلْنَا مَا لا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ) البقرە/286. خوای ئێمەپێمان هەڵمەگرەئەوشتەی کەلەتواناماندانەبێت وچاوپۆشیمان لێ بکەولێمان خۆش ببەوبەزەییت بێت پێماندا، تۆدۆست وسەرپەرشتی ئێمەیت وسەرمان بخەبەسەرگەلی کافراندا.

وصلی الله علی قائدنامحمدواله اجمعین

15/ڕەمەزانی/1408ك

**پوختەی قسەکانمان**

براوخوشکە مسوڵمانەکانم، ئەم چەندخاڵەی خوارەوە پوختەی قسەکانمانە:

1. ئیسلام زەوی بەموڵکی خوادائەنێ وهەمووخەڵکیش بەبەندەی خوائەزانێت بەبێ جیاوازی.
2. ئیسلام هەمووشتێکی ڕەوای بەلاوەپێویستەونابێ بۆهیچ شتێکی پێویست خەڵك ماتەڵ بکرێت.
3. ئیسلام بێجگەلەپاداشی دنیایی وسوپاس، پاداشی چەندبەرانبەری هەیەبۆچاکەکاران لە ڕۆژی دواییدا.
4. ئیسلام بێجگەلەتۆڵەوسزای لەدنیادا سزای قیامەتیشی هەیە بۆتاوانباران واتە، هیچ کەس ناتوانێت لەدەست یاسادانەر دەرچێت وەك یاسا دەستکردەکان نیە کەبەفرت وفێڵ خۆتی لێ دەربازبکەیت.
5. ئیسلام دان بەموڵکیەتی تاك دائەنێ وبەهۆیەکی گرنگی پێشکەوتن وئاوەدانی زەوی ئەزانێت بەپێچەوانەی شیوعیەت.
6. لەیاسای ئیسلامدا ئەبێ هەمووکەس بەبێ جیاوازی، خۆراك وپۆشاك وماڵی هەبێت.
7. هەرکەسێك توانای ئیشی ڕەوای هەبێت ئەبێ ئیش بکات.
8. هەرکەسێك توانای ئیشی نەبێت ئەبێ لاخواروی خۆراك وپۆشاك وماڵی هەبێت.
9. کرێ بەگوێرەی جۆروسودی ئیشە.
10. ئیسلام دژی سەرمایەدارییەوبەهێواش ومرۆڤ ناسانە بۆنەهێشتنی هەنگاوهەڵئەگرێت.
11. ئیسلام بیروباوەڕ بەخواوبەڕۆژی دوایی بەگرنگترین هۆی دابین کردنی ئابووری ئەزانێت.
12. ئیسلام بێجگەلەبیروباوەڕ ڕەوشتیش بەهۆیەکی تری پێشکەوتنی باری ئابووری ئەزانێ، ئەم دووخاڵە تەنها لەیاسا ئاسمانیەکاندا هەیەوئیسلام سەرقافڵەیانە.
13. لەئیسلامدا هەموویاساوڵ وچاودێریە میریەکان بۆدابین کردنی ژیانی خەڵك بەکارئەهێنرێت، جاکێ یاسایەکی لەئیسلام چاکترشارەزایە، باپیشانی داولەگەڵ ئیسلامدا بەراوردی کات ئێمە تەنیا ئیسلام بەدڵسۆزوداشتیاری خەڵك ئەزانین وهەموویاسادەستکردەکان تاقیکرانەوە هیچ کامیان بێجگەلەسەرگەردانی وڕۆژڕەشی ئینسان شتێکی تریان بۆخەڵك نەهێناونایشی هێنن.ئەم ڕێبازە زیاترلەهەزارساڵ تەجروبەی فەرمانڕەوای هەیەولەهەرسەردەمێکداچاکتردەستی پێوەگیرابێت خەڵکی بەختەوەرتربووە، دەی مرۆڤ ئەگەرنەخەڵەتاوی فریونەدراوی بۆبۆئەم یاسایەوهێنانەوەکایەی هەوڵ نادەیت ژیرانەیەك کەم بیربکەرەوەوبزانەتۆبۆچی خەریکی وسودوزیانی چەندە.

خوێنەری بەڕێز، ئەمەکورتەباسێك بوو سەبارەت بەئابوری لەئیسلامدا وڕێگای چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی، جائینجاسەرنجێکیش بدەلەبەرنامەخوێنمژەکەی سەرمایەداران وبەرنامە بێ سەروبەرەکەی کۆمۆنیستی کەلەیەکەمیاندا مرۆڤ کراوە بەبەندەی پارەوسەروەت ولەدووهەمیاندا کراوە بەبەندەی سك وناولنگی بەڵام ئیسلام

سەروەت وسامانی بۆیەپێ خۆشە چونکەبەهۆیەکی گرنگی ئەزانێ بۆخزمەتی ئایین وگیان وژیری وناموس هەرکاتێك سەروەت وسامان زیانێك بەیەکێك لەوانە بگەیەنێت ئەوسەروەت وسامانەی بەلاوەبێ نرخە، واتەئیسلام سەروەت وسامان بەخزمەتکاری مرۆڤ دائەنێت، هەرچەندیەکێکە لەوپێنج شتانەی کەئایین تەنیا بۆئەوانەدانراوە ئەمما لەدوای هەموویانەوەیە واتە، ئایین، گیان، ژیری، وەچە(نسل)ومالْ.

بەلاْم لەمەکتەبەکانی تردا، ئەوانەی کەئەمرۆ رۆڵەی مسوڵمانیان لەرێبازی خوالاداوەوبەرەوئەملاوئەولامان ئەبەن وبارمان پێ ئەکێشن لەبەرخاتری سامان، یان سك تێرکردن نەئایین باوی هەیەونەگیان نرخی بۆدائەنرێت ونەژیری رێزی هەیەونەباسێ لەناموس هەیە!!بەڵکوهەموویان فیدای سامان وسك کراون، پێم ناڵێی، مرۆڤ وەختێك ئایین وگیان وژیری وناموسی پێشێل کرائیتر چ مافێکی تری هەیە؟؟!!ئەگەرئایینت نەداوەبەپارەیان سك تێرکردن چۆن دژی ئاینت ئیش ئەکەیت؟! وەئەگەرژیریت پێشێل نەکراوە چۆن رێبازی دژی خۆت هەڵدەبژێریت وەیان بەپارەی خۆت وعارەقی ناوچاوانت خۆت بێ عەقڵ ئەکەیت؟!وەئەگەرناموست پێشێل نەکراوەبۆچی لەکاتی ناوبردنی ناموسدا زۆرتورەومۆنیت؟! وەئەگەرناموسی خۆت بەرەلاْئەکەیت بەناوی ئازادی یەوە چۆن ناموسی خەڵك ئەپارێزیت؟؟!! وەئەگەر هیچکام لەمانەش دەرك ناکەیت هەواڵ پرسی ژیری کەیت چاکترە!!

بەهیواین هەموومرۆڤەکان مرۆڤایەتی خۆیان بدۆزنەوەوپیاوانە دەستی برایەتی ودۆستایەتی بەیەکتربدەن ویەك دڵ ویەك گیان ویەك ئایین بۆسەرفەرازی گەلەکەمان تێکۆشن تائەم گەلەستەم لێ کراووچەوساوەمان بەخۆشی وخۆشبەختی هەردووجیهان بگات(وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ)الاعراف/96.

واتە: ئەگەرخەڵکی وولاتان باوەڕیان بهێنایەولەخوابترسانایە ئەڕژابەسەریاندا فەڕوبەرەکەتی ئاسمان زەوی بەلاْم ئەوان بێ باوەڕبوون بەڕێبازەکەی خوابۆیە خواگرتنی وتۆڵەی کردارەکانیانی لێ سەندنەوە، براینە زۆرچاك لەم ئایەتەگەورەوپیرۆزەوردبنەوە چونکەبۆتەمێ کردنی ئێمە هاتووە جائەگەر ڕوکەینەوە ئایینەکەی خوادڵنیابن کەژیانی هەردووجیهانمان چاك ئەبێت ئەگینا حاڵمان لەئێستاچاکترنابێت وهەمیشە خۆزگە بەپارئەبەیین؟!ئەوەش چاك بزانن کەخواهیچ زیانێك ناکات لەدژایەتی کردنی خەڵك بۆئایین بەڵکوهەرخەڵك خۆی زیانی پێ ئەگات وسەرئەنجامیش ئەبێ بگەڕێتەوەبۆپێشگای خوابۆحیساب وەکوخۆی ئەفەرموێت(إِنَّ إِلَيْنَا إِيَابَهُمْ (25) ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا حِسَابَهُمْ )الغاشيه/ 25-26، واتە: بەڕاستی بۆلای ئێمەئەگەڕێنەوەولەپاشائێمە موحاسەبەیان ئەکەین، براوخوشکی کوردم پێشینەوتویانە، حەق ڕەقەیان حەق تاڵە، هیوادارم نەرەقی قسەکانم بتان تارێنێ ونەتاڵیەکەی بتان گێجێنێ دۆست ئەوەیەبتان گرێنێ ودوژمن ئەوەیەبتان کەنێنێ ئیتر بەخواتان ئەسپێرم.

والسلام عليكم ورحمه الله

عبدالقادر تەوحیدی

کۆمەڵگای ڕانیە

